# نووسەری کورد

گۆڤاری

یەکێتی گشتی ئەدیبو نووسەرانی عیراق

نووسینگەی رۆشنبیریی کوردییە

ژمارە ٣ خولی سێهەم تشرینی یەکەم ١٩٨٥

## لەم ژمارەیەدا

سلێمانی.. سلێمانی.. سلێمانی.. سلێمانی..

# سلێمانی...

پێش ماوەیەك لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی ئەدەب ڕۆیشتینە خواروی عیراق.. برادرێکی ئازیزمان لە سەرەتای وتارەکەیدا گوتی: ئەگەر لە سەرەتای وتارەکەمدا تا دوایی یەکەی هەر ناوی شارەکە بڵێم هێشتا نا توانم حەقی شارەکە بدەمەوە... بەڵام من لێرەدا نەوەك برادەرکەمان گوتی.. بەڵکو زیاتر... بەتێ من دەڵێم گەر ئەز تا هەمە هەر بڵێم سلێمانی.. سلێمانی... سلێمانی... سلێمانی حەقی شاری هەڵمەتو قوربانی ناگەیێنێتە ئاستی حەز کە لە قولایی هەستەوە دەر دەچێت... سلێمانی... سلێمانی.. سلێمانی... ئەی زادگای زاناو داناو ئەدیبو نووسەرو پیاو زیرەك کە هەمیشە مەشخەڵی ڕووناکی بویتە لە ڕێگای سەربەرزی کوردو کوردستان.. سلێمانی.. سلێمانی... هەر هێندە بەسیەتی کە جێگای ژیانی نالیو سالمو بێکەسو پیرەمێردو گۆرانو سەلامو قانیعیش بووە.. ئەوانەی کاروانی ئەدەبو شیعریان هەڵگرتووەو سەرکێش یان کردووەو بەئەمانەتەوە دایانە دەست نەوەکانی داهاتوودا... سلێمانی.. سلێمانی.. سلێمانی.. چەند بەرزیت کە گوزەرگای کەڵە ئەدیبو نووسەرو هونەرمەندو شۆڕشگێڕو خەباتکەریت بۆ خۆشی کوردو سەربەرزی نیشتمان هەوڵیان داوەو هەوڵ دەدەن.

سلێمانی.. سلێمانی.. سلێمانی.. چەند بڵندیت کە ئارامگاو جێگای دوایی گەلێك کەسی کە لە پێناوی کورد نیهایەتیان بەژیان هێناوە... لەش و گیانیان خۆڵی سەیوانیان پەین کردووەو بونەتە مەشخەڵێ لە ڕێگای ئازادی کوردستان لەبەر ئەوە بەستە سلێمانی... کیفایەتە شاری هەڵمەت و قوربانی.. کە هەر وەك شێخ ڕەزای مەزن گووتوویەتی.. هیچ کاتێك خزمەتکاری عەجەم نەبوویت و سەرت دانەنوواندووە بۆ ئالی ئوسمان..

سلێمانی.. سلێمانی.. سلێمانی.. هەر ئەوەشە بەرزی و بڵندی و مەزنی و لە بیر نەچوون لەیادی هەر کوردێکی ئەم خاکە دەچەقێنی و لەناو دڵیدا ڤیانی شار دەروێنێ.

هێژایان یەکێتی نووسەرانی کورد کە بیری لە ئاهەنگ و سیمناری بیرەوەی دووسەد ساڵەی سلێمانی کرد هەر لەم ڕوانگەوە چاك دەیزانی کە دوو شت هەنە هەموو کوردێك پێکەوە وەك یەك خۆشیان دەوێت.. هەر چەند جیاوازی بیروبڕوا بۆچوونیان هەبێت... لە دوورترین ڕاست تادوورترین چەپ هەموویان هاوبەشن لە ڤیان و خۆشەویستی ئەم دووشتە و کەسیش نیە لەم بازنەیە دەربچێت، ئازیزان ئەم دوو شتەش یەکێکیان نیشتمیان و خاکە و ئەوی تریان ئەدەبی کوردە...

کەس هەیە لە کورد بەرامبەر شیعری باباتاهیرو جزیـری و نالی دڵی پـڕ خۆشی و شادی نەبێت و هەستی وەك ڕۆژ نەبریقێتەوە ؟. نەخێر نیە...

دیســان کەس هــەیە زاخــۆو سلێمانی ودوهــۆك و هەولێـرو ڕەوانـدوزو هەڵەبجەی خۆش نەوێت ؟ نەخێر نیە... کەس هەیە لە ئێمەی کورد کە وشەی پیرۆزی کوردی بەسەر لاپەڕەی کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکانـدا ببینێت و دڵی پڕ ڕووناهی و جەرگی بەشادی هەڵنەپەڕێت چونکە زمانی شیـرینی کوردی پـەرە دەسێنێت و خزمەتی مێژومان دەکات..؟ کەس هەیە شارەکانی کوردستان لەبەر چاوی پەرە دەستێنن و جوانن. خەم بخوات..؟ ئەمە وانیە.. لەبەر ئەوە دەڵێمەوە هەموو کورد هاوبەشن لەم ڤیان و خۆشەویستیەدا... خۆشەویستی وڵات و ڤیانی ئەدەب و ڕشنبیری کوردی..

لێرەدا نوقتەی مەبەست.. مغزو بازنەی ئەمەوێ دیارو

ئاشکرا بکەم ئەوە ئەم ئەدەب و وڵاتە موڵك و سامانی هیــچ کەسێـك نیە بۆخۆی، بەڵکو هەموو کوردێك مەزن و بچوك زاناو نەزان بەلەنگازو هەژارو دەوڵە-
-تمەند بەتواناو زیرك و بێتوانا هەموویان پێکەوە هاوبەشن لەم ڤیانەدا ڤیـانی ئەدەب و سەقافەی کوردی هی‌هەموویانە هیچ کەسێك ماف و حەقی ئەوەی نیە بڵێت من لێپرسراوو خاوەن و مەسئول ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیم.. ئەم ئەدەبە هەزارەها گەنج لە پێناویدا خوێنی خۆیان بەخشیوە کەس نابێت بێت و بڵێت

من خاوەنیمو من مەسئولیم... چونکە هەر وەك گوتم ئەدەب هی کوردەو هەموویان هاوبشن لەم سامانەداو لە هیچ کاتێکدا ئەم سامانەدابەش ناکرێت... ئەم سامانە لە ژێر زانستی ناسراودایە کە دەڵێت: یان هەموویان هیچ لەبەر ئەوە وەك کوردێك رەفزی ئەوە دەکەین کە کەسێك یان هەر لدیەك خۆی بە خاوەنی یان مەسئول ئەدەبەکەمان بزانێت ولایەکانی تر لە بیربچنەوەو کەسی تر بە هاوبەش نەزانێت.

برایینە.. ئەم ئەدەبە... ئەم زمانە... ئەم وشە پیرۆزو شیرینە مولکی کەسێك نین بۆخۆی ئیحتکار بکات..

بەڵێ.. لەبەر هەر هۆیەك بێت ماوە بۆیەکێك هەبێت یان لەبەر بارو زروفێکی تایبەتی یان مەسئولیەتێکی میری کەسێك خۆی بەمەسئولی ئەدەب و سەقافەتی کوردی بزانێت وخۆی بە خاوەنی ئەم سامانە بزانێت لەلای هەموو کوردێك شتێکی ناڕەواو راستنیە.. چونکە هەر وەك گوتمو دووبارەی دەکەمەوە کە ئەدەب و سەقافەتی کوردی سامان ومولکی هەموو کوردێکەو هەموومان مافیپاراستنو هابەش لەم ئەدەبەوە هەیەو کەس، ناتوانێت خۆی بە عەرابو خاوەنو مە سئولی ئەم زمانو ئەدەب و وشەیە بزانێت... ئەگەر ئیمرۆ کەسێکە خۆی بە خاوەن بزانێت لەبەر بارو زروفێکی تایبەتی سوبەینێ چی دەڵێت چونکە چۆن ئەو خۆی دەزانێت.. منوتۆو ئەوی ترو هەر کوردێك خۆمان بەخاوەنی دەزانین.

ئازیزان ئیمرۆئێمە لەیەکێتی نووسەرانی کورددا کە لقییەکێتی گشتی ئەدیب و نووسەرانی عیراقەکار دەکەین لەبەر ئەوەی گەیشتینە قەناعەت و بڕوایەکی پتەوو چاك کە رێگایەکی چاك و باشە بۆ خزمەتی وشەی پیرۆزی کوردی بەلام هەڤاڵینە بێ گومان بزانن ئەگەر هەر کاتێك ئەم خزمەتەمان لە قاڵەبی ئەم وشەیە دەرچویان نەمانتوانی خزمەتی ئەدەبەکەمان بکەین بێگومان نە هەروازی لێ دێنین بەڵکو تا هێزمان تێدا هەیە غار دەدەینو بەجێ دێڵین. ئەبێ ئەم شتەش ئاشکراو روون بێت.. زۆر کەس هەیە دەڵێت ئێمە بۆشتێك ئەم رێگایە مان گرتووە، بەلام باهەمووچاك بزانن کەهاتنمان بۆمەیدانی ئەدەبی کوردیمان تەنها بۆ خزمەتی زمانی شیرینی کوردی بوو هەر وەها بۆ تاواندنی ئەو سەهۆڵەی بە سەر یەکێتی نووسەرانی کورد کۆبووە لە بەر حەزی هەر کەسێك بووبێت و هیچی تر.

دیسان نابێت ئەوەی لە بیر بکەم کە ئەو کەسانەی خۆیان بە مەسئول لەقەڵەم دەدەنو ئەدەب و رۆشنبیری کوردی بە سامانی خۆیانو لە بازنەی

لێپرسراوی خۆیان دەزانن و ئەتوانن لە ساعەتێکدا روومەت بگۆڕن و خەڵك بێنن هەر وەك خۆیان حەزیان لێیەو حەز لێدەکەن... باباش بزانن کەئێمە ئەو رووەتانە نین بەکەیفی خۆیان بمان هێنن و بمان بەن... هەر وەها هیچ کەسێك ناتوانێت فەرزی رای خۆی بکات لە سەرجادەو مەیدان و رێگای ئەدەبە پیرۆزکەماندا.

دیسان ئەوەش نابێت لەبیربچێت کە خۆ بە خاوەن زانین و بەمەسئوولی ئەدەبی کوردی پەیوەندی بەپلەو سنووری سۆزو ئیخلاسەوە هەیە بۆئەم ئەدەبە.. کەچی خۆ بە خاوەن زانین موطلەق هیچ لایەك و هیچ کەسێك ئەم شتە بەشتێکر رەواو راست نازانێت.

هەروەها دەڵێمەوەو گەلێك جاریش گوتیتم کە یەکێتی نووسەرانی کورد بەدیلی هیچ لایەك نیە چیمیری یان غەیری میری هەر وەها رێگا لە هیچ کەسێك بۆخزمەتی ئەدەب و رۆشنبیری کوردی ناگرێت.. بەڵام بە بێوچان و بەهەموو هێزیەوە بەرگری لە خۆ دەکات بەرامبەر ئەوانەی تاوان و سیفات و قسەی بێ مانای بۆ دروست دەکات.. چونکە تانهو هەر کەسی لەم یەکێتیە دابێت خۆی بەدڵسۆزو موخلیسی ئەم ئەدەبە دەزانێت وەهەر بۆ خزمەتی ئەم وشە پیرۆزە هاتۆتە کۆڕو مەیدانی ئەم ئەدەبە نەوەك بۆ شتێکی ترو باهەموو لایەك بزانێت هەر کاتێ مەسەلەکە لەم جغزو بازنەیە دەربچێت.. ئێمەش راوبیرو بڕوای تایبەتی خۆمان هەیە لەم مەسەلەدا.. ئینجا لەبەر ئەوەبا برەك کراوەتربین و دەست لەملی یەك بکەین بۆ خزمەتی ئەم ئەدەبەش هەموومان هاوبەشین لە خۆشەویستی وڤیانی‌دا، لەدوایی‌دا باهەر پیرۆز بێت بیرەوەری و جەژنی دووسەد ساڵەی دامەزراندنی سلێمانی.. وباهەر بمێنێت سلێمانی هەر وەك وابووە لە رۆژی دامەزراندنی‌یەوە.. سەرچاوەی ئەدیب و نووسەرو زاناو خۆبەخت کەرو خزمەتگوزاری ئەدەب و وڵاتمان.

**ئیتر سوپاس**

**دکتور نافع ئاکرەیی**

---

**وتەی یەکێتی نووسەرانی کورد**
**١٩٨٥/٩/١٥**

---

# ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی پەراوێزو بیبلیۆگرافیا

غازي فاتح وەيس

## پێشەکی:

ئەگەرچی لێکۆڵینەوە ئەوەندەی کۆنی زانیاری کۆنە، بەڵام دوای شەڕی دوەمی جیهان زانایان بەشێوەیەکی تەواو دەرکیان بە هەبوونی پێوەندی نێوان لێکۆڵینەوەو پێشکەوتن کردو لێکۆڵینەوەیان بەهۆیەکی گرنگی پێشکەوتن دانا.

ئەو ڕێبازەی کە ئادەمیزاد بۆ یەکەم جار بەکاری هێناوەو لە دواییدا بە شێوەیەکی ئاسایی پەیڕەوی کردووە، لە پێناوی هەڵمالین و کەشف کردنی نهێنیەکانی سروشتدا بووەو بۆ ڕەخساندنی ژیانێکی خۆش‌ترو ئاسان‌تر بووە.

هەر وەها چنیدیّ کەشف کردن و هەلمالین ئالوز بووە، ئەوەندە ریبازی گەیشتن بە ئەنجام و لیکولینەوە پەرەی سەندووەو لە گەلیدا سنووری زانست و زانیاری فراوان تر بووەو لە دواییدا لیکولینەوە بووە بە بەشیکی زانستی و لە نیو مەزرای زانستەکانی تردا رەنگی داوەتەوە. بەم جورە هەولدانی ئادەمیزادو زانیاری و زانست بوونە بە قالبیکی لەیەك نەبچراو.

ئەگەر ئاوریك لە میژووی ریبازی لیکولینەوەو لیکولینەوە خوی بدەینەوە، ئەبینین لە سەرەتادا گەلیّ ساکار بووە، هەر وەکو ئادەمیزاد چون بە ساکاری لە شت گەیشتووە ئاواش ریبازیکی ساکاری بەکار ـ هیناوە بو وەدی هینانی خواستەکانی و بەرە بەرە پەرەی سەندووەو تا گەیشتووەتە ئەم رادەیەی ئیستا. بە پیّی تیروانینمان دەربارەی میژووی لیکولینەوە، ئەتوانین پەرەسەندنی ریبازی لیکولینەوە بەم تەرحە نەخشە بکیشین:

پەیدابوونی ئادەمیزاد ← ئالوزبوونی کەشف کردن و هەلمالینی نهینیەکانی سروشت ← ئالوز بوونی هینانەدی ئەنجام ← فراوان بوونەوەی ئاسوی بیرکردنەوەو میشکی ئادەمیزاد ← پەرەسەندنی ریبازی لیکولینەوە ← فراوان بوونەوەی زانست وزانیاری.

ئەگەر واز لە سەردەمی کون بهینین و سەیریکی سەدەیەك لەمەو پیش کەین، ئەبینین میسو دولوژی بو یەکەم جار و بە شیوەیەکی زانستانە لە بواری فەلسەفەدا سەری هەلداوە. بو نموونە زانای بەناوبانگی فەرەنسی (دیکارت) میسودی لیکولینەوەی فەلسەفی و زانستی ی هینایە کایەوە. لەبەر ئەمە ئەم زانایە تا ئیستاش شوینیکی دیادی کراوی لە زانستی میسو دولوژی و مەزرای فەلسەفیدا هەیە. ئەمجا میسو دولوژی سنووری مەزرای فەلسەفی شکاندوو هاتە نیو مەزرای میژووەوە و دوای لە بوارەکانی ئەدەب و زماندا تەرزی کوتا. میسودولوژی هەر بەمەوە نەوەستا بەلکو لە هەموو بواریکی دیکەدا جیگەی خوی کردەوەو وەکو مەزرایەکی یەکانە لە زوربەی زانکوکانی جیهاندا خوینرا.

ئەوەی شایانی باسە میسو دولوژی لە زانستیکەوە بو زانستیکی تر ئەگوریّ، بەلام بەشیوەیەکی گشتی ئەم بەشانەی خوارەوە ئەگریتەوە:

١ ـ هەلویستی چەند زانایەك، یان کومەلیك زانا دەربارەی زانستیکی تایبەتی و هەر یەکیك لەم زانایانە لە روویەکەوە لەو زانستە ئەکولنەوە، بو نموونە لە رووی بەراوردکردن و وەسف کردن و میژوو... هتد.

٢ ـ ئەو ڕێبازو تەکنیکەی کە لە شی کردنەوەی بوارەکانی ئەو زانستەدا بەکار ئەهێنرێن.

٣ ـ ئەو ئەنجامانەی کە لە ئاکامی ئەو جۆرە شی کردنەوەو لێکۆڵینەوەیەدا وە دەست ئەهێنرێن وچۆنێتی و ڕێبازی چەسپاندنیان.

کەوابوو پەیڕەوی کردنی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی هەر سێ حاڵەتەکە گەلێ گرنگە بۆ ئەو کۆمەڵەی بیەوێ پێش بکەوێ چونکە ئەبینین فەرەنساییەکان کاتێ لەساڵی (١٧٩٠) دا بیریان لە ڕێبازی لێکۆڵینەوە کردەوە ئەوەندە پێش کەوتوو نەبوون، هەر وەها دوا بە دوای فەرەنسا، ئەڵەمانیاش بیری لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی کردەوەو پێشکەوت و ئەمریکاش دوا بە دوای ئەمان بوو بە مەڵبەندی کاری لێکۆڵینەوەو ئینگلیزیش نهێنیەکەی کەشف کردو وئەمجا هەموو ئەو وڵاتانەی کە ئێستا بە پێشکەوتو دائەنرێن پەیڕەوییەکی تەواوی ڕێبازی لێکۆڵینەوە ئەکەن لەو سێ بوارەدا.

کەوابوو ئەبێ ئێمە پەیرەوییەکی تەواوی ڕێبازەکانی ئەو سێ حاڵەتە بکەین: یەکەم ڕێگا بەهەموو کەسێك نەدەین سەر بەهەموو قوژبنێکی هەموو زانستێکدا بکات و دووەم لە لێکۆڵینەوەدا پەیڕەوی ڕێبازی لێکۆڵینەوە بکەین و سێیەم ئەنجامەکان بەتەواوی بچەسپێنین بەلام بەداخەوە تا ئێستا بەدەگمەن ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی لەم بوارانەدا پەیڕەوی ئەکرێ.

لێرەدا پەراوێزو بیبلیۆگرافیا ڕوون ئەکەینەوەو بە هیوای ئەوەی بتوانین لە دەرفەتێکی تردا چەند بەشێکی تریش دەستنیشان بکەین.

یەکەم: پەراوێز چییە ؟

پەراوێز، (Footnotes) ئەو کۆمەڵە وشەو ڕستانەیە کە لە داوێنی لاپەڕەکانی کتێب ولێکۆڵینەوەدا ئەنووسرێنەوەو بیروڕایەکی تایبەتی، یان لاوەکییان پێ دەر ئەبڕدرێ.

دووەم: لە چەند حاڵەتدا پەراوێز بەکار ئەهێنرێ ؟

پەراوێز لەم حاڵەتانەی خوارەوەدا ئەنووسرێتەوە:

١ ـ ڕوونکردنەوەی مەسەلەیەکی لاوەکی کە پێوەندییەکی ڕاستەو خۆی لەگەڵ بابەتە بنەڕەتیەکەی نێو کتێب و لێکۆڵینەوەکەدا نییە. ئەم جۆرە پەراوێزە بە زۆری بیروڕای لێکۆڵەرەکەی پێ دەر ئەبڕدرێ.

٢ ـ ڕوونکردنەوەی بیروڕایەکی لاوەکی لێکۆڵەرێکی* دیکە. لەبەر ئەوەی ئەو بیروڕایەی کە لەم جۆرە پەراوێزەدا دەر ئەبڕدرێ پێوەندی بە لێکۆڵەرێکی ترەوە هەیە، ئەبێ لێکۆڵەرەکە دەستنیشانی ئەو سەرچاوەیە بکات کە ئەو بیروڕایەی لێوە وەرگرتووە.

٣ ـ لێکۆڵەر لە پەراوێزدا ناوی کۆن و زاراوەی تایبەتی ڕوون ئەکاتەوە. ئەگەر ڕونکردنەوەکە بە پێی بۆ چوونی لێکۆڵەرەکە خۆی بوو ئەوا پێویست بە دەستنیشان کردنی سەرچاوە ناکات، بەلام ئەگەر بە پێی بۆچوونی لێکۆڵەرێکی تر بوو ئەوا ئەبێ دەستنیشانی سەرچاوە بکات، واتە ئەو سەرچاوەی کە ڕونکردنەوەکەی لێوە وەرگرتووە.

٤ ـ دوای وەرگرتنی دەقی هەر نووسەرێکی تر، ئەبێ لێکۆڵەرەکە لە پەراوێزدا دەستنیشانی ئەو سەرچاوەیە بکات کە ئەو دەقەی لێوە وەرگرتووە.

٥ ـ لە وەرگێراندا، وەرگێر لە پەراوێزدا بیروڕای تایبەتی خۆی ئەنووسێتەوە، یان ئەو وشەو زاراوانەی کە کۆنن یان قورسن یان ڕوون نین لە پەراوێزدا شیان ئەکاتەوە و ڕوونیان ئەکاتەوە، لە هەر حاڵەتێکیشدا ئەنووسێ وەرگێر.

٦ ـ بەزۆری لە زیندو کردنەوەی دەستنووسی کۆندا پەراوێز بەکار ئەهێنرێ.

٧ ـ هەر تێبینیەکی تر کە لێکۆڵەرەکە بە پێویستی ئەزانێ لە پەراوێزدا ڕوونی ئەکاتەوە.

سێیەم: پەراوێز چۆن ئەنووسرێتەوە ؟

لێکۆڵەر ئەتوانێ پەراوێزەکان لە کۆتای کتێبەکەدا یان لێکۆڵینەوەکەدا بنووسێتەوە بە مەرجێك ژمارەکانی نێو لێکۆڵینەوەکە لەگەڵ ژمارەکانی پەراوێزەکەدا بگونجێن، بەلام بەزۆری پەراوێز لە داوێنی کتێب و لێکۆڵینەوەدا ئەنووسرێتەوە، لەم حاڵەتەدا ئەبێ پەراوێز هێڵێك لە تێکستی لێکۆڵینەوەکە جیا بکرێتەوە. لە چاپکردندا، پەراوێز بە خەتێکی وردتر چاپ ئەکرێت، بۆ ئەوەی بەچاکی لە وتارەکە جیا بکرێتەوە.

چوارەم: سوودی پەراوێز چییە ؟

زۆربەی لێکۆڵەرە بەناو بانگەکان، تۆمار کردنی پەراوێز بە ڕادەیەکی یەکجار زۆر بە زیان بەخشی دائەنێن، چونکە ئەبێتە هۆی بچراندنی زنجیرەی بیری خوێنەر کاتێ لێکۆڵینەوەکە ئەخوێنێتەوە. لەبەر ئەمە، هەر بەڕای ئەو لێکۆڵەرانە، ئەبێ لێکۆڵەر تا ئەتوانێ لە لێکۆڵینەوەکەیدا پەراوێز کەم بکاتەوە و بیروڕای نێو پەراوێزەکان ئاوێتەی بیرە بنەرەتییەکانی نێو لێکۆڵینەوەکە بکات و لەگەڵ یەکتردا بیان گونجێنێ و پەراوێزیش تەنیا بۆ ناوی سەرچاوەو ژمارەی لاپەڕەکانی سەرچاوەکان تەرخان بکات و شی کردنەوەیەکی ئەو تۆش نەخاتە نێو پەراوێزەکانەوە.

ئەگەر تەماشایەکی ئەو کتێبانە بکەین، کەلە سەردەمی ئێستادا لە ئەوروپا بلاو ئەکرێنەوە، ئەبینین بەڕادەیەکی یەکجار کەم پەراوێزیان تێدا ئەنووسرێتەوەو تا ڕادەیەکیس ژمارەی لاپەڕەو ناوی دانەری ئەو سەرچاوانەی

که سوودیان لێ وەرگیراوە لە نێو تێکستە بنەڕەتییەکەدا ئەنووسرێنەوەو ئەخرێنە نێو کەوانەوە.

پێنجەم: جیاوازی نێوان پەراوێزو وبیبلیۆگرافیا.

هەروەکو وتمان پەراوێز ئەو بیرو ڕا لاوەکییانەیە کە لە داوێنی کتێبدا یان لە کۆتای کتێبدا ئەنووسرێنەوە، بەڵام بیبلیۆگرافیا، واتە سەرچاوە، ناوی دانەرو ئەو سەرچاوانەیە کە لێکۆڵەر لە نووسینەوەی کتێب و لێکۆڵینەوەدا سوودیان لێ وەرئەگرێ. ئەگەر لێکۆڵەر بە هەر شێوەیەك سوودی لە هەر سەرچاوەیەك وەرگرت ئەبێ بە تەواوی دەستنشانی ئەو سەرچاوەیە بکاتو لە بیبلیۆگرافیای کتێبەکەدا تۆماری بکات، چونکە لێکۆڵەر ئەبێ ئەمانەتی عیلمی بپارێزێو ناوبردنی سەرچاوەو دەستنیشان کردنی ناونیشانی کتێب و ناوەرۆکی هەموو لێکۆڵینەوەیەك مافێکی ڕەوای نووسەرەکەیەو نابێ نووسەرێکی تر ئەم مافە پێ شێل بکات. هەروەها ناو نەبردنی ئەو سەرچاوەیەی کە لێکۆڵەر سوودی لێ وەر ئەگرێ بە هەڵەیەکی گەورە ئەژمێردرێ وبگرە بە تاوانی دژ بە زانست دائەنرێتو ئەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین کە بەرهەمی هەر لێکۆڵەرێك بە پێی یاسا پارێزراوە.

بیبلۆگرافیا بریتیە لە تۆمار کردنی ئەم مەعلووماتانەی خوارەوە:

١ - ناوی یەکەمو دوەمو سێیەمی دانەری سەرچاوەکە، ناوی سێیەم یان لەقەب لە پێشەوە ئەنووسرێتەوە.
٢ - ناوی تەواوی کتێبەکە.
٣ - دەزگای لە چاپدانی کتێبەکە (سەرچاوەکە).
٤ - ئەو شوێنەی کە کتێبەکەی تێدا چاپکراوە.
٥ - ساڵی لەچاپدانی سەرچاوەکە.
٦ - ئەگەر سەر چاوەکە وەرگێڕراو بوو، ئەوا ئەبێ لە پێشەوە ناوی دانەرەکە بنووسرێتەوە ئەمجا وەرگێڕەکە.
٧ - ژمارەی لە چاپدانی کتێبەکە ئەگەر هەبوو.

ئەوەی شایانی باسە، هەرگیز ناوی دانەرو کتێب، یان با بڵێین ببلیۆگرافیا (سەرچاوە) وەر ناگێڕێتە سەر زمانێکی ترو ئەمجا بنووسرێتەوە، واتە سەرچاوە بەو زمانە ئەنووسرێتەوە کە پێی نووسراوەتەوە نەك وەرگێڕانەکەی، چونکە ئەم کارە بەکارێکی ناڕەوا دائەنرێو دژ بە هەموو لاییەنێکی ڕێبازی لێکۆڵینەوەیە.

ببلیۆگرافیاش بە دوو شێوە تۆمار ئەکرێ:

١ ـ بە پێی کۆنی ی سەرچاوەکان، واتە ئەو کتێبەی لە پێشدا چاپکراوە پێش ئەو کتێبە ئەنووسرێتەوە کە لە دواییدا چاپکراوە. بۆ نموونە ئەوکتێبەی کە لە ساڵی (١٩٧٠) دا چاپکراوە پێش ئەو کتێبە ئەنووسرێتەوە کە لە ساڵی (١٩٧١) دا چاپکراوە.

٢ ـ بە پێی ئەلف و بێ سارچاوەکان ڕیز کرێت، واتە بە پێی یەکەم پیتی ناوی سێیەمی یان لەقەبی نووسەرەکە ڕیز ئەکرێن. بۆ نموونە ئەو ناوەی کە بەپیتی (أ) دەست پێ ئەکات پێش ئەو ناوە ئەنووسرێتەوە کە بە پیتی (ب) دەست پێ ئەکات.

لێرەدا سێ نموونە بۆ تۆمار کردنی سەرچاوەی سێ زمان ئەهێنینەوە:

یەکەم: کوردی.

ـ بەسیر، کامل حەسەن عەزیز. زمانی نەتەوایەتی کوردی. کۆڕی زانیاری عیراق (دەستەی کوردی). بەغا. (١٩٨٤).

دووەم: بە عەرەبی:

ـ الحسن، احسان محمد. طرق البحث الاجتماعي. مطبعة جامعة الموصل. الموصل. (١٩٨٢).

سێیەم: بە ئینگلیزی:

— Sweet Henry — New English Grammar: Part I. Oxford: Clarendon Press (1981).

گۆڤاریش بەم شێوەیە ئەنووسرێتەوە:

ـ بالدار، ابراهیم امین ـ الاستعداد للقراءة والكتابة. مجلة زانكۆ، الانسانیات ـ المجلد (٧) العدد (٢) ص (٨٣ ـ ١٧٢) ـ (١٩٨١).

هەروەها ئەتوانرێ لە سەرچاوەکە دەستنیشانی ئەو بەشەش بکرێت کەسوودی لێ وەرگیراوە، ئەگەر لە نووسینەوەی کتێبەکەدا لێکۆڵەر تەنیا سوودی لەو بەشە وەرگرتبێ.

بەم جۆرە بۆمان دەرکەوت کە پەراوێز ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی بیروڕایە، بەڵام بیبلیۆگرافیا ناوی سەرچاوەیەو بە بێ زیادو کەم یان دەستکاری کردن ئەنووسرێتەوە. لەپەراوێزدا تەنیا ژمارەی لاپەڕەو سێیەم ناوی نووسەرەکە ئەنووسرێتەوە، یان تەنیا ناوی سێیەمو ساڵی نووسینەوەکە، ئەگەر مەبەست دەستنیشانکردنی بیروڕایەکی تایبەتی نووسەرێك بێت.

پەراوێز:

* لێکۆڵەر: واتە «باحث». بۆ مەبەستی کورتکردنەوەی وشەی لێکۆڵەرەوە وشەی لێکۆڵەرمان بەکار هێناوە.

سەرچاوەکان:


— Encyclopedia Britannica. VOL (15) (1973 — 1974) (P. 738).

— Lester, J. D. Writing Research Papers. Second Edition. Scott and Foresman Company. U — S — A (1976).

— Menzel, D. H. Writing a Technical Paper. Magrow — Hill Company. U. S. A. (1972).

- الطاهر، علي جواد. منهج البحث الادبي. المؤسسة العربية للدراسات والنشر. بيروت (١٩٧٩).

- وەیس، غازی فاتح. ڕێبازی لێکۆڵینەوە. ١٩٨٥ (دەستنووس).

# هەڵسەنگاندنە رەشبینی یەکەی ماموستا قەرەداخی

□ محەمەد ئەمین هەورامانی □

**بەرێز، ماموستای قەرەداخی، کاک حەمەعەلی، لە رۆژنامەی «العراق»ی ژمارە (٢٦٧٦)ی رۆژی چوارشەمەی ریککەوتی ٢١ ـ ١١ ـ ١٩٨٤دا، وتارێکی بەناوونیشانی «میرزا ئۆلقادرو هەڵسەنگاندنێک»ەوە بڵاو کردووەتەوە تیایدا دڵسۆزی یەکی بێ هاوتای خۆی بەرامبەر بەئەدەب و زمانی نێو «بەرهەمی میرزا ئۆلقادر» دەربڕیوەو منیش زۆر قەرزارباری بووم، چونکە بەهۆی وشە ئەدەبی یەکانی نێو هەڵسەنگاندنەکەیەوە، دەربارەی رووالەت و ناوەڕۆکیەوە، هەندێ شتی وەها** فێربووم، کە لە وەوپێشتر هەستم پێ نەکردبوون، وائێستەش لەم دەرفەتەدا، کەبە هۆی هەمان وتارەوە رەخساوە، نەختێ رووالەتی ئەورووالەت و ناوەڕۆکانە، کەدەمی باسمان لە سەریان بوو، بۆ خوێنەری بەرێزی رۆشن دەکەینەوە.

**کاک حەمەعەلی، بە رووالەت وا دەریخستووە، کەئەگەر (دڵسۆزیی ی بۆ وێژەو زمانی کوردیی نەبوایێ نەدەهاتەوە دەنگ) و ئەم**

**گوتەشیە وەها رازاندو وەتەوە، کەوا لە حویەربکا، یاحود، بڕوای بڕوا بۆ ئەوە، کەئەدەبو** رۆشنبیریی کوردیی هەتیو کەوتووەو تەنانەت دۆستیشی نەماوە، کەبتوانێ پارێزگاریی ماف بکاو بۆیە دەبێ ئەو ئالای وەسیداریەتی هەلبگرێ و بە چاو نووقاوی بەملاو بەولاداو بە هەموو هێزو تەوانای خۆیەوە فەرمان دەربکات، بۆ هاندانی کاربەدەستان تاوەکو مەسرەفی لە چاپدانی میرزائۆلقادرو تەنانەت پارەی قاقەزەکەی لە نووسەری بسێننەوە و هەروەها فەرمانیش دەر دەکا بۆ ئەوەی بەرهەمی ناوبراو ئەخرێتە ناو کتێبخانەوەو هەر تەنیا بەو جۆرە فەرمانانەش رازی نابێ، بەلکو هێرشیش دەباتە سەر ئەو کەسی، کە بەرهەمەکەی ئامادە کردوەو نرخا ندوویەتیو لۆمەی ئەوەش دەکا کە بریاری لە چاپدانیداوە !!

روایژکردن، بە هەر کەسێ، بۆبە پیزکردنی بەرهەمی ئەدەبی، یاهەرجۆرە بەرهەمێکیتر، زۆر رەوایە، هەروەها راویژ کردن بەکەلەپوور دۆستیکی وەك کاك حەمەعەلی بۆ پیاچوونەوەو سە رپەرشتی کردنی هەندێ جۆرە کەلەپووریکی ناوچەی سۆرانو بابان، دیسان هەر جێگای خۆیەتی، بەلام بۆ جۆری کەلەپووریتر، کە وەك شێوە هەورامانی، نەك هەر دەستنادا، بەلکو هەرلێی تێ ناگاو تەنانەت ناشتوانێ دوو کەلیمە قسەی پیبکات !!

ئەم جۆرە تەنگ پێ هەلچنین زۆرە ملێیانە، بەدرۆ خستنەوەی ئەو کورد واتەنیەیە، کە دیژێ: (نان بۆنانەواو گۆشت بۆ قەساب).

ئەگەرچی، کاك حەمەعەلی واپیشانداوە کە هەلگری ئالای دلسۆزی یەو بۆئەمەش مۆرکی بروا پێ کراوی پانو پۆری بە خۆیدا ناوە، بەلام ئەو جۆرە ئالایەو ئەو جۆرە مۆرکە، هەرگیز ناتوانن ناخو ناوەرۆك بشارینەوە، چونکە وشەکانو ئاوازەی دەرچوونو زراندنەوەیانو بانگەوازی ناواخنی واتایان وامان بەدەستەوە دەدەنو دەمانخەنە باوەرێکەوە، کە رووالەتو ناوەرۆکیان دوورن لەیەکتری یەوەو دژی یەکتریشن.

بەشێوەیەکی روونتر، لە تواناداهەیە بیژین «بە هۆی لە بیژنگدانی سەرپاکی هەلسەنگاندنەکانی - هەر لەو هەلسەنگاندنە رەشبینییەی کە لە بارەی بەرهەمەکەی عوسمان هەورامی یەوە بلاوی کردەوە، تا دەگاتە ئەوەی خلیل مونەوەرو ئەوەی (میرزا ئۆلقادریش) جگە لە تاکە مەبەستێکی تایبەتی خۆی نەبێ، هیچ جۆرە مورکێکیان پێوە دیار نییە، ئەویش ئەو پەردە رەشەیەکە بەرچاوی چاویلکەی هەلسەنگاندی کاك حەمە عەلی گرتووەتەوە، هەرچی جۆرە

رازاندنه وەو جوانكاریی‌و رەوانبێژی هەبن هەمووی شاردوونەتـەوەو توانـای بینینی نەهێشتووە.

بەشیوەكی، ئاشكراتر، رێبازی هەڵسە نگاندنەكانی كاك حەمەعەلی وامان لێ دەكـا، كە بێـژین، مامـۆستای قـەرەداخی بـە زۆرەمـلی‌و خـۆی بـەسـەر هەڵسەنگاندندا داسە پاندووە. چونكە ئەو رێبازەی، كە ئەم گرتوویەتیەبەر لە هیچ جۆرە رێبازێكی قوتابخانە كانی رەخنە سازی ناكات.

**جا، ئەگەر هەڵسەنگاندنەی كاك حەمەعەلی، لە فەر هەنگی رەخنـە سازی‌دا، نەبێ‌و رێگایەكی تایبەتی خۆی بێ، گومان لەوە ناكەین كە دەبێ بـەرهەمی كـەفف‌و كولێكی هـەڵهاتـووی دەروونی بێ‌و بۆ مـاوەیەكی درێـژخایـەنیش پەنگی خـواردبێتەوە، بـۆیەوا بـەو جۆرەبـە (گژمـاو) بەربووەو هیچ جۆرە بەستێ نییە بتوانێ، بەرپەنگی پێ بداتەوە.**

**لەم رووەوە كورد واتە نێی هەیەو دێژێ، (تیخی خۆت بەگەردنی خۆت !) منیش پەنا دەبەمە بەر كردەوەی واتاو ئـاوازو دەنگدانـەوەی وشەكانی‌خۆی:ـ**

١ ـ مامۆستا قەرەداخی، هەڵسە نگاندنە كەی بەم جۆرە دەست پێ دەكاو تیایدا دەڵێ: «بێ ئیختیار دەستم دایە قەڵەم‌و كەوتمە تۆماركردنی سەرنج».

بەدەستەوەنەمانی جڵەوی بێ ئیختیاریی، بەپێی بۆچوونم دەبێ یەكێ لەم دوو هۆیانە بووبێ، یا دە ستێكی زوردار، یاخود خوانە خاسە نە خـۆشی یەكی تەنی؛ یان نەفسی بێ یاخود ئەندامی.

ئەوجا بۆدەبێ مامۆستا ئەم توهمەتە بخاتە ئەستۆی خۆیەوە، یاخود ئەگەر دۆودۆشاو تێكەڵكـردنی بەو نیـازەبێ گوایـا، دەیەوێ شـوێنەواری ئـەو هێزە شـاردراوەیە، كـە پاڵی بـەوەوە ناوە، بـۆ ئەو كـردەوەیـەی ـ (ئـەگـەرچی لەو شاردنەوەیەی زۆر دڵنیا بێ) بشارێتەوە ـ هە رگیز نەیتوانیوەو ناشتوانێ ئەو كەفف‌و كوڵە دەروونیـەی بشارێتـەوە، چونكـە هەروەك لەوەوپێش تـر وتمان، وشەكانی خۆی، هەریەكەیان بە جۆری ئاوازو سازی واتای خۆیەوەو بەبانگە واز، نهێنییە ناخی‌یەكانی ئاشكرا دەكەن.

بۆ وێنە، كاك حەمەعەلی، وای لەقـەڵەم داوە، كە هـەورامانی نـەخۆشی گۆڕینی (غ) بە (خ)ی هەیە، چونكە ئەوواتە: (هەورامانی) وشەی (پێخامبەر) ی بە (خ) نوسیوە !

ئەوجا، بۆ وەڵامی ئەم وتەیەی مامۆستا قەرەداخی، دەبێ بڵێم، بـۆچی دەبێ من نەخۆش‌بم ئەگەر هاتوو نووسیم (قەرەداخ)و بـۆدەبێ ئەو نـەخۆش نـەبێ‌و دەروونساغ بێ ئـەگەر بنـووسێ (قەرەداغ) ! ئـەگەر هـەردوكیشمان

ئاگاداری ئەوە بین، کە کۆڕی زانیاریی بۆ ماوەی چەند ساڵێکە خەریکی کێشەی ڕێنووسەو هێشتا هەر نەیتوانیوە بە ئاوات بگات و خۆیشی یەکێکە لەوانە، کە تەنیا تاکە وشەیێ، لەو تارێکدا، بەدوو شێوە ڕێنووس دەنووسێ !

هەر لەبەر ئەوەی، ئەم خاڵە پەیوەندی بە لایەکی ترەوەهەیە، هەر لەم وتارەدا و لە جێگایەکی ترەوە هەندێ شوڵەی لێکۆڵینەوەیان دەخەینەسەر.

مامۆستا قەرەداخی، لە سەرەتای هەڵسەنگاندنەکەیدا، وا لە قەڵەمی داوە، کە بەرهەمی (میرزا ئۆلقادر)ی بە چاوێکی وردبینی یەوە خوێندبێتەوەو لۆمەشمان دەکا، چونکە بەپێی بۆچوونی ئەو (بەشی واتاکەی) باش لێك نەدراوەتەوە.

ئەوجا، ئەگەر مامۆستا بە وردیی بەرهەمەکەی خوێندبێتەوەو هەمووشتێکی بە ڕچاو کەوتبێ، چۆن لۆمەمان بۆ جۆری لێکدانەوەی واتاکەی دەکا. ئەگەریش بەوگۆتەیەی رازی‌یەولێی دڵنیایە، چۆن دەبێ بوختان بۆخۆی بکا !!

بۆ پاڵپشتی ئەم وتەیەم، پەنا دەبەمە ئەم وەرگرتەیەی ناو بەرهەمی میرزائۆلقادر، کە لە لاپەڕە (١٠) یدا هاتووەو دێژێ: «قەسیدەکان، بەداوێن، وشەبە وشەبە بێ پاش و وپێش خستن، واتایان لێکدراوەتەوە، بەمەبەستێ ئەوەی زاری هەورامانی نەزانێ، بتوانێ بە تەواویی لێی تێ بگاو تەنانەتیش فێری ببێ...».

لە هەڵسەنگاندنەکەی کاك حەمەعەلیدا، هەندێ وشەی جنێوگۆنە بەکار هاتوون، کە شایانی بڵاوکردنەوەنین، یەکێ لەوانەش، بۆ وێنە وشەی (بەچکە) یە. وشەی (بەچکە) یاخود (بێچووە) خۆی لە خۆیداو بەم جۆرە بەکار هێنانەی ئەو دژوێنێکی دوو دەمە، واتە؛ وەك شیری بڕندە، بە هەردوولارا، دادەپاچێ ! بە دەمێکی هەواڵ دەگەیەنێ بەجێگای بەرپرس و بە دەمەکەی تریشی دژوێن ئەدات.

لایەنی (جنێودان) ەکەی ئەوەیە، کە وشەی (بەچکە) بۆحەیوانات و مەڕو ماڵات و مارومێرو بەکار دەهێنرێ، بۆ وێنە کورد یژێ (بەچکەپشیلە) بەلام (بەچکەموسوڵمان) هەرگیز ناوترێ ئەگەر مەبەست لە جنێودان و سووککردن نەبێ !! ئەوجا، ئەگەر کاك حەمەعەلی، خۆی وشەی وەهای بۆ جنێو بەکار نەهێناوە، ئەوە شتێکی‌ترە، بەلام ناتوانێ باوەڕی خوێنەر وا لێکات، کە ئەو مەبەستی دژوێندان نەبووە !! لەم ڕووەوە ئەگەر شتێ شەفاعەتی بۆبکا، مەگەر هەر تەنیا، فرەیزی (بێ‌ئیختیار) یەکەی‌بێ !!

دەمەکەی تری وشەی (بەچکە) پڕەلە هاندان لە مەبەستی دووبەرەکی خستنەوە، ئەمەش زۆر باش ڕێی تێ دەچێ، چونکە نووسینی تری بڵاوکردووتە، کەبۆنی دووربەرەکی خستنەوەی لێوە بڵاو بووبێتەوە.

وێنەشمان، بۆ ئەو وتەیەمان، بڵاوکردنەوەی هەندێ شیعری نالەباربوون، کەلە (لاپەرە ـ ١٩٢ ـ تا ـ ٢١٣)ی بەرگی دووەمی کەلەپوو ری ئەدەبی کوردی دا بڵاو بووبوونە تەوەو بووبوون بە هۆی بەرپاکردنی ئاژاوەیێ لە نێوان کوردیی کاکەیی و کوردیی ئیسلامداو لە وانەش بوو؟

تەشەنە بسێنێ وببێ بە هۆی خستنەوەی دووبەرەکی یەوە ئەگەر دڵسۆزی هەردوو لا، نەکەوتنایەتە ناو نێوانیانەوە.

بە هۆی ئەمەوەو بەم بۆنەشەوە کاك حەمەعەلی سەرزەنیشم دەکا، چونکە من وەك ئەو ئایەتی قورئانم لە بەر نییەو بۆییم بە کار نەهێناوە !! ئەگەر بۆ ئەمەی، تاکەمەبەستی هەر ئەوە بووبێ، ئەوە زۆر بە هەڵەدا چووە، چونکە ئەگەر ئەو میهنەیەتی وبەسەر ئەوەوە دەژی، ئەی من چی !!!

من نەمدەویست ئەو سەرگوزەشتەیەی نێوان (ئەوو من) بڵاوبکەمەوە، تەنانەت بۆ کەسیشم نەگێڕایەوە، نەوەکو دڵی کاك حەمەعەلی گەردبیگرێ، بەڵام وشە رەققە جنێواویەکانی و توهمەتە بێ بنەڕەتەکانی و داتاشینە خوانە ترسیەکانی ناو هەڵسەنگاندنە رەشبینی یەکەی بە زۆرە ملی بڵاوکردنەوەی، ئەمەی سەپاند بەسەرما:ـ

چەند ساڵێ لەمەوبەر، یاخود بەبێ زیادو کەم پێش دەستپێ کردنی جەنگی عیراق و ئێران، کەڵکەڵەی کۆکردنەوەی دیوانی (میرزا ئەوڵقادری پاوەیی) و (میرزا ئۆڵقادری تەوێڵەیی)م کەوتبوە سەر و بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم خولیایەش پەیوەندیم بەوانەوە دەکرد زۆرتر خەریکی کەلەپوور کۆکردنەوەن.

هەر بۆ هەمان مەبەست، بانگەوازیشم لە هاوکاری دا بڵاوکردەوەو بە هۆی بانگەوازەوە هەندێ شیعرم بۆ هات کە لەسەر شێوەی سۆرانی بوون و بۆ ئەوەی ئەم بەرهەمەی من سوودیان نەبوو !

وەختێ، کە کاك شێخ ئەمینی شێخ عەلائەدینی نەقشبەندی ماڵی گوێزایەوە بە غداو سەرپاکی ژمارەکانی رۆژی کوردستانی لە چەند بەرگێکدا جەم کردبوون و لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی، بۆ ماوەی شەش مانگی داینە لای من بۆ ئەوەی ئەگەر بتوانم سوودیان لێوەوەگرم ئەم بەرگانە سەرچاوەی هەرە ڕاست و هەرە سەرەکیم بوون.

ئەوەی کەسە بارەت بە میرزا ئۆڵقادرو هۆنراوەکانیەوە لەوێ دا هەبوو، بۆ

هێنانەدیی بەرهەمی دیوانی، کومسایی (کافی) نەبوو. لەبەر ئەوە، هەر لەهەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی دیوانی نەکەوتم.

سەرگوزەشتەکەی: لەبەر ئەو هۆیەی سەرەوە بە پێی گفتوپەیمانی (کاکەحەمەعەلی) خۆی عەسرانێکی درەنگ بۆ ماڵیان چووم‌و، لە نێوانماندا رووی‌دا ئەمە بوو: کاک حەمەعەلی نە یهێشت کەلەبەرێ بدۆزمەوە، بۆ ئەوەی مەبەستی چوونەکەی خۆمی، ئەگەرچی دەیزانێ، پێ‌بڵێم بەوەی، کە دەسپێشخەری کردو باسی «بەرگی دووەمی کەشکۆلی کەلەپووری ئەدەبی کوردیی» هێنایە پێشەوەو داوای لەمن کرد کەهەوڵی بۆ بدەم بۆ ئەوەی دەزگای بڵاوکردنەوەو رۆشنبیریی کوردیی بۆی لەچاپ بداو بەو پێیە، گوایا، من‌لەوێ بەرپرسی بەشی رۆشنبیریم.

وەڵامی من بۆ ئەم داوایەی مامۆستا، هەر تەنها ئەوە بوو، کەئەو لە ساڵێك‌دا هەققی لە چاپدانی یەك بەرهەمی هەیەوتا ساڵێکیش بەسەر، بەرهەمی پێشووی‌دا تێنەپەرێ، مافی‌ئەوەی نییە، کە بەرگێکی تری بۆ لە چاپ بدرێ، (بەپێی یاسای دەزگاکە).

دووبارە کردنەوەی ئەم داوایەی کاك حەمەعەلی، کەوەختی خۆی هەمان داوای کردووە هەمان وەڵامم داوەتەوەو لە بەردەمی منداو وەك میوانێکی جێگای سەرسورمانە.

بەرپابوونی ئەمەو دەرکەوتنی هەندێ رووالەتی دڵگیریی بە دەم‌وچاوی مامۆستاوە، دڵنیایان لەوە کردم کە مەبەستی ئەو تێ بگەم. بەڵام هەربۆ دڵەبرِوانەکەرەی خۆم پێم بە جەرگی خۆمدا ناو لە دڵی خۆمدا وتم، ئەگەرچی مەبەستی ئەولەوە (داش‌بە داشەکەیە)، بەڵام دەبێ، من‌لەوە دڵنیاتربم‌و داوای یارمەتیە کەی هەر لێ بکەم.

داخۆ، وەڵامی داوای یارمەتیدانەکەی منی چۆن دابێتەوە باشە !لەوانەیە خوێنەر وا نەچێ بەدڵیەوە، ئەگەر بڵێم، هەموو یارمەتیەکەی کاك حەمەعەلی هاتەوە سەر ئەوەی کە بە من بێژێ: (خۆمامۆستا ئەوەی کە هەمبووە لەهاوکاریدا بڵاوم کردووەتەوە، بۆت هەیەبۆی بگەرێتەوە !)

ئەوجا، وەك لە کوردەواریدا باوەو دەوترێ (نەخواردەو نەخواستە) هەڵسامەوەو ماڵئاواییم لێ کردن.

پەیماندانی مامۆستاو پووچکردنەوەی هەمان پەیمانی لە لای خۆیەوەو سوێندخواردنی (لەماڵەوە)، کە بەرهەمی میرزای بەلاوە نەماوەو ریزکردنی ناوی هەندێ پارچە شیعر لە ناو هەڵسە نگاندنەکەیدا، گوایا لە ماڵی ئەوداو لەلای ئەو وەرم گرتوون، بێگومان برِوای خوێنەر دەخاتە گێژاوەوەو هەروەها واشی لەمن

کردووه، که ناوبەناو بە شریتی ڤیدیۆتێپی سەرگوزەشتەکەدا بڕۆمەوە نەوەکو هەڵە یەکی تێدابێ و دیسان لەوە دڵنیادەبمەوە، که من زۆرراست دەکەم ناهەقق لەگەڵ ئەودایە.

**ب - لەرووی زمانناسی یەوە.**

شایەنی باسە، ئەگەر کاك حەمەعەلی خۆی لەقەرەی زمان و زمانەوان و زمانناسی نەدایە، من هەرگیز ناویم نەدەخستە ناو ناوانەوەو باسیشم نەدەکرد. بە هەر حاڵ، بەهۆی ئەم باسەوە، گۆتەی هەندێ راوچیانی لای خۆمان دەکەوێتەوە یادم، که ئەویش بەم جۆرەیە: «زوربەی وەخت راوچی (نەپێك) -دەسخۆار -که دەچێ بە کەژیدا، ئەگەر هاتو تفەنگێکی لە کەوێك تەقاندو نەیپێکا، سوێند دەخوات و دێژێ: «وەڵڵاهی، پڕی سەرینێ پەڕم لێ کردەوە، بەڵام چی بکەم، کەوی دوابڕاو نەکەوتە خوارەوە !».

لەوانەیە، هەندێ مرۆڤی سادە بڕوا بە راوچی بکەن و بێگومان هەندێکی وریاش بەقسەکەی پێکەنینیان دێ، چونکە، نەك تاکە کەوێ، بەڵکو بەپەڕی پەنجا کەوێکیش ئەوجا بەشی سەرینێکی منداڵانەدەکات ئەگەر پەڕیان هەبێ !

مامۆستا، لە سەرەتای هەلسەنگاندنە رەشبینی یەکەیدا، غەلبەیەکی سەر چەنچاڵاوی بەرپا کردبووو بۆ چەند جارێکیش بە وشەی زمانەوان و زمانەوانی (زمانناس و زمانناس) یەوە رازاندبوویەوە، بەمەش دیسان گفتوگۆکەی نێوان (بەردناشۆوچەرچڵ) دەخاتەوەبیر، کەوجەوهەرەکەی وامان تێ دەگەیەنێ «هەر کەسێ لە هەرچی شتێکدا فەقیربێ، هەمیشە، هەر ئەوشتە، وا بەسەر زمانیەوە !»

ئەوە زۆر راستە، بۆیە لێرەداو بەم بۆنەیەوە، بەتەمای راستکردنەوەی هەندێ رستەی لەنگی نێو هەڵسەنگاندنەکەی کاك حەمەعەلی - م.

**کاك حەمەعەلی وتوویەتی: «بە هیوای ئەوە نەبووم لیێ وە دەنگ بێم»**

ئێمە ئەگەر لەم رستەیەی ورد ببینەوەو بیخەینە بەر شوڵەی زمانناسی یەوە، وا هەست دەکەین، که (یەکەم) لە شێوەی ئەدەبی لای داوە، چونکە پرپێوزیشن، یاخود حەرف (جەڕر)ی کردووەبە (وە)، که ئەمە شێوازەیەکی کوردەواری یە نەك کوردیی ئەدەبی، و (دووەم) بە هۆی وەرگێڕاندنی حەرفی جەڕەکەوە شیرازەی زاراوی (هاتنەوەدەنگی)ی تێك وتاران داوە، دەبوایێ بیوتایێ «بەهیوای ئەوە نەبووم لیی بێمەوە دەنگ» ئەگەرچی بەم جۆرەش هەر ناتەواویی ریزمانی تێدایەو ئەویش ئەوەیە، که ئەم رستەی تێ هەڵکێشراوە هەر لەبەر ئەوەشە، کەبەبێ (ئامراز) رستەی تێ هەڵکێشراوی وەها پێك نایەت.

**بەم پێیە دەبێ ڕستە ناسادەکە بەم جۆرەبێ:- «بە هیوای ئەوە نەبووم کەلێی بێمەوە دەنگ».**

ئەوجا جیاوازیی‌ی نێوانی ڕستەی ناسادەی «بەهیوای ئەوە نەبووم لێی وەدەنگ‌بێم» و ڕستەی ناسادە «بە هیوای ئەوە نەبووم کەلێی بیمەوە دەنگ» ئەم خاڵانەن:- (یەکەم) بە کارهێنانی (وە) لە جیاتی (بە)و لە جێگایەکدا کە جێگای نییە، (دووەم)، فرێدانی پاشبەندێکی (کاریی)، ئەویش (- ەوە) یەو ئەم جۆرە پاشبەندانەش لە زمانی ئەدەبی‌یە کگرتووی کوردی‌دا بە شێکی سەرەکیی‌و دەوری کاریگەریان هەیە (سێیەم)، قووتدانی ئامرازی (کە)، کە وەك جۆرە ڕاناوێ، لێرەدا کاری خۆی دەبینیو توانای ئەوەی هەیە، کاری تێهەڵکێشانی دوو ڕستە لە چوار چێوەی جۆرێکی ناسادەدا دابرێژێ...

هەروەها ئەگەرچی ئەم ڕستانەش (کوشییا)و (هاتەکوشتن) شێوەزاری ناو کوردەوارین، بەڵام لە شێوەی ئەدەبی‌دا بەکار نایەن، چونکە لە شیرازەی (دەمکاتی‌کارا نەزانراو) ئەدەبی، کە (کوژرا) وە ، دەرچوون.

**لەهەمان هەڵسەنگاندا، کاك حەمەعەلی وتوویەتی: «.. نەیتوانیوە زمانی نووسین خۆی مشت ومالْ بکاو لە گریو قۆرتو هەڵەی زمانی ڕزگار بکات».**

**لێرەدا، سەری نووکەقەڵەممان دەورەی ئەمو شانەی داوە: (بکا)و (بکات)و (ڕزگار) و (زمانی).**

خاڵی‌یەکەم، ئەوەیە، کە نووسەر یان دەبێ (بکا) یاخود (بکات) بەکار بهێنێ، چونکە هەردووکیان یەك واتا دەدەنو یەك ئەرك دەبەن بە ڕێوە. دووەم، لەوشەی (زمانی)دا، مەبەستی‌چی‌یە ؟ مەبەست‌تەنسیبە، یاخود ئیزافە، ئەگەر (- ی) وشەی (زمانی) بۆنیسبەبێ، ئەووەختە دەبێ (- ی) کەی (گیر) بێ‌و واتە بەم جۆرە (زمانیی)، یاخود (ی)ی ئزافەی بۆ زیاد بکرێو بەم جۆرە بنووسرێ (زمانی)ی. لە هەردوو حاڵەتەکەدا، دەبێ ئەو وشەیە هەڵگیرێو بکرێ بە وشەی (ڕێزمانە). سێیەم قووتدانی (ڕاناوێکی) زۆر دیاریی، ئەویش ڕاناوی (ی) یەوکە دەپێ بخرێتە سەر وشەی (ڕزگار) وببێ بە (ڕزگاری)، تا ڕستەکەش بەم جۆرەلێ‌بێ:- **(.. نەیتوانیوە زمانی نووسینی خۆی مشت‌ومالْ بکاتو لە گریو قۆرتو ڕێزمانی ڕزگاری بکات).**

ڕوواڵەتی هەرە سەیری ئەوەیە، چونکە مامۆستای قەرەداخی، خۆی هەر تەنیا شێوە زاری دەزانێ ئەگەر هاتوو وشەیێ، یاخود زاراوێ، لە شێوەزارێکی

دیکەدا بەکا هێنراو ئەو مانای نەزانی، ئە ووەختە ئەوەبە ناکوردیی دەزانێ. بۆ وێنە وشەی (چواندن)و (شوبهاندن)ی لە واتادا لەیەك جوێ کردووەتەوەو وشەی (ترنجاندن)ی بەهاو واتای (چواندن) لەقەڵەمداوە. چونکە واتای رستەی «میرزا خەڵکی پاوەی نەچواندووەتە شتی دیکەو هەر وەك مرۆ هێناویەتە مەیدانەوە)، لەبەر بوونی وشەی (چواندن) تیایدا، تێ نەگەیشتووە.

ئەوجا، بۆ ئەوەی واتای جۆروا جۆرو بەکارهێنانی هەمەڕەنگی وشەی (چواندن) باش رۆشن بکەینەوە، واله چەند جۆرە رستەیەکدا بە کاری دەهێنین.

ئەو کوڕە لەباوکی دەچێ!
ئەو دینارە شڕە دەچێو ئەوەی پێشووش چووئەوی دیکەشیان بە حاڵ چوواند.
میرزا ئوڵقادر فارسەکانی (چوواندە) ئاینەماڵو عوسمانیەکانیشی (چوواندە) کولله، بەلام خەڵکی پاوەی (نەچوواندە) شتی دیکە.

لەرستەی یەکەمدا، وشەی (دەچێ) بە واتای (دەکا) یاخود (دەشوبهێ) هاتووە. لە هی دووەمیاندا وشەی (دەچێ) واتای (دەڕوات) یاخود (سەرف دەبێ) دەدات، هی (چوو)ش واتای (رۆیشت) یاخود (سەرفبوو) یاخود (وەرگیرا) دەداو وشەی (چوواند)یش واتای (سەر فیان کرد) دەدات. لە هیسێیەمدا، وشەی (چوواندە) واتای (شوبهاندە) ئەداتو (نەچوواندە)ش واتای (نەشوبهاندە) دەدات.

کاك حەمەعەلی، وەك چارەی ئامرازی (کە)ی نەویّ وایە، چونکە ئەگەر وانەبێ، ئەی بۆ زوربەی زۆری ئامرازە (کە) یەکانی هەڵسەنگاندنەکەی پەراندووە. بۆ وێنە کاك حەمەعەلی وتوویەتی: «بریا مامۆستا هەورامانی، کاتێ کارەکەی کاکڵە کردو هاتە سەر ئەوەی بلاوی بکاتەوە...»

**لێرەدا، لەنگی رستەکە، هاوار لە خوێنەری بەرێز دەکاکە ئامرازی (کە)ی ناتەواوە !! دەوری ئامرازی (کەیش، لەرستەدا، جگە لە ڕستەساز (زمانناسی رستەساز) خوێنەری ئاساییش هەستیپێ دەکات !!**

بە هەرحاڵ، رستەکەی کاك حەمەعەلی دەبێ ئامرازی (کە)ی بۆ بخرێتە سەرو بەم جۆرە بنووسرێتەوە: «بریا، مامۆستا هەورامانی، کاتێ کە کارەکەی کاکڵە کردو هاتە سەر ئەوەی بلاوی بکاتەوە...».

لەم رستەیەی‌دا مامۆستا دووشتی ڕێزمانی گرینگی لە بیرچووە، ئەوانیش: یەکەم، دەیەوێ لە پێشەوە بە رامبەر ئاوەڵکاری (بە ئاسانی) ئەوجا کاری (ناتوانێ) وە دڵنیابێ، بەڵام بۆی نە هاتووە سەری لێ دەرنە چووەو ئاوەڵکاری (بەئاسانی) خستووەتە دوای کاری (ناتوانێ)وە، ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە بۆ ئەو واتایای ئەو مەبەستیەتی، کە دەبوایێ بیوتایە: (خوێنەر بە ئاسانی ناتوانێ...). دووەم، قووتدانی پرپێوزیشنی (تێ) کە دەبێ بکەوێتە پێشی وشەی (بکات) وەو جییاتی فرەیزی (تێبگات) دروست بێ‌و بکە وێتە جێگایەوە.

**واتە سەرپاکی رستەکە دەبێ بەم جۆرەبێ: (خوێنەر بە ئاسانی ناتوانێ لە مەبەستەکانی تێ بگات)، ئەوجا ئەوەی کە کاک حەمەعەلی دەیەوێ، جێبەجێ دەبێ !!**

**کاک حمەعەلی ناڕەزایی خۆی بەرامبەر وشەی (چەپاو) دەربڕیوەو چونکە ئەو وشەی (چەپاوڵ) بیستووەو لە واتای وشەی (چەپاو) تێ ناگات.**

**ئەم لۆمەیەی کاک حەمەعەلی، بەرامبەربەوشەی (چەپاو) هەر تەنیا منی نەگرتووەتەوە، بەڵکو میرزا ئۆلقادریشی گرتووەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش‌دا، وێنەکەی میرزای بە نموونە بۆ دەهێنینەوە:**

**«ڕەواندز هەتا خانەقی‌و زەهاو**
**مەندەلی‌و بەسرە یەکسەر داچەپاو»**
**«ل - ١١٨ - بەرهەمی میرزائۆلقادر»**

بە هۆی بوونی وشەی (چەپاو) و (چەپاوڵ) و (چەپاوکەر)ەوە دەبێ ئەو کورد واتەنیە بهێنینەوە یاد، کەدەڵێ: (قسەیێ بکە بۆ خواو یەکێکیش بکە بۆ خواداد)، لەبەر ئەوە دەبێ بڵێین لە ناو کوردەواری‌دا، (چەپاو) هەیەو (چەپۆکەر) و (چەپاوڵ) یش هەن. (چەپاو) بە واتای (تاڵان) هاتووەو (چەپاوکەر) و (چەپاوڵ)یش هەردووکیان هەرواتای (تاڵانکەر) دەدەن.

لەبارەی بەکارهێنانی زاراوی (دەربارە)وە، مامۆستا قەرەداخی ناڕەزایی خۆی، بۆ جۆری بەکارهێنانەکەی دەربڕیوەو گوایا ئەو زاراوە بەو جۆرە بەکار نایەت !

هەندێ زاراو، لە زمانی کوردی داهەن، کە لە شێوە زارێکەوە بۆ شێوەزارێکی‌تر، یان واتایان وەك یەك نییە، یاخود بە کارهێنانیان.. بێگومان ئەم کارەزیان لە شێوەزاری ئەدەبیی نادا، چونکە ناتوانن شیرازی تێك بدەن ئەگەر ئاگاداریی جۆری بەکارهێنانەکە بکرێ !

بەشێوەروونتر، با لەم دوو رستەیە وردبینەوەو سەرنجی ڕێزمانی خۆمان سەبارەت بە هەردوو رستەکەوە تۆمار بکەین:ـ
١ ـ چوومە هەولێرێ.
٢ ـ چووم بۆ هەولێر.

لە رستەی یەکەمدا، پاشبەندی (ـ ە) چووەتە سەر وشەی (چووم)و پاشبەندی (ـ ێ)ش چووتەتە پاشکۆی وشەی (هەولێر). لەهی دووەمدا، پریپۆزیشنی (بۆ) لە نێوان (چووم)و (هەولێر)دا هەیەو ئەم پریپۆزیشنەش، وا دیارەلە بری دووشت هاتووە، ئەوانیش پاشبە ندەکانی (ـ ە) و (ـ ێ). یاخود ئەتوانین بێژین، کە ئەو پاشبەندانە لە بری پڕپیوزیشنی (بۆ) هاتووە.
ئەوجا پرسیارێ، لێرەدا، دەهێنێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە: ئایا رستەی یەکەم، لەزاری ئەدەبیدا دەبێ بەکار بهێنرێ ؟
وەلام: بە پێی بۆچوونی من، نەخەیر. هی یەکەمو بەو جۆرە هی ناو کوردەواریی و بۆ ناوهەلگرانی شێوەزاری خۆی دروستە، بەلام بۆ شێوەزاری ئەدەبی دروست نییە. لەگەڵ ئەوەشدا شێوەزاریی ئەدەبی بۆی هەیە زوربەی زۆری زاراوو وشەی شێوەزارە کوردی یەکانی تر وەربگرێ بە پێی شیرازەی خۆی لە رستەدا بەکاریان بهێنێ.
**پێش ئەوەی روو بکەینە هەندێ لەو زاراونە، دەبێ ئەوە بزانین، کە ئەگەر هەندێ پرپێوزیشن بۆ درێژە پێدانی (ماوە) یان وەخت (واتە ـ حالێ‌بوو) بەکار هێنران ئەووە ختەئەو ناوەی کەبەدوایی یەوەدێ دەبێ پاشبەندی (ـ ەوە) ی حالێ وەربگرێ، بۆ وێنە:ـ**
ـ ئەو خانووە، **لەباوکەوە** بۆ کوڕ هاتووەتەوە.
ـ ئەو پیاوە، بەروبەوە دەرچوەتە دەرەوە
ـ ئەو زەویە، **لەباوكو باپیرەوە** بۆ وەچە هاتووەتەوە.
ئەوجا، ئەگەر (پرپێوزیشنێ) یاخودبابڵێین‌پارتیکە لێ لە گەڵ هەندێ ئاوەڵکاردا یەکیانگرتوزاراویان دروستکرد، بۆ هەمان مەبەستیش بەکارهات، ئەوە بێگومان هەر هەمان ئەرك دەبا بە ڕێوە.
بۆ وێنە:ـ
دەر + بار = دەربار
لە + بار = لەبار
یان: دەر + بارە = دەربارە
لە + بارە = لەبارە

بۆ بەکار هێنانیان لە رستەداو لە بەر ئەو هۆیانەی سەرەوە، من بەم جۆرە بەکاریان دەهێنم:-

- تۆ، لە بارەی دڵداری یەوە زۆر ئەزانی، بەلام لە بارەی مۆرفولۆژی یەوە کۆڵیت !

- تۆ، دەربارەی کاکەیی یەوە، شتێ نازانی، لەوانەیە لەمەولا دەربارەیانەوە شتێ فێرببی.

شایان باسە، هی وەها هەیە، ئەم جۆرە بەکارهێنانانە، بەهەڵە دەزانێ، بەلام لە توانایدا نییە یەك هۆ لەو رووەوە بهێنێتەوە !!

**جـ - سە بارەت بەتەرجومە.**

کاك حەمەعەلی قەرەداخی، وای لەقەڵەم داوە، کە بەرهەمی (میرزا ئۆلقادر)م تە رجومە کردبێ و تەرجومەیەکی کاڵ و کورچیش و بەم بۆنەیەوە وتوویەتی: «وا هەست دەکەم، کە تەرجومەو وەگێڕداروێکی کورچ وکاڵ دەخوێنمەوە».

کاك حەمەعەلی، لەگەڵ ئەم گۆتەیەیدا، نەیتوانیوە رستەیێ بۆ پاڵپشتی قسەکەی. بهێنێتەوە.

پێش ئەوەی بڕوینە سەر هێنانەوەی نموونەی زۆر تەواو، بۆتەرجومە، وای بەباش دەزانم لەو گۆتەی کاك حەمەعەلی ورد ببمە وەو بیدەمە بەر شوڵەی زماننناسی.

کاك حەمەعەلی، لێرەدا (لەم رستەیەیدا، کەئێستە حاڵی حازر دەمی باسمان لەسەریەتی دوو وشەی هێناوەتەوە کە ئەوانیش وشەکانی (تەرجومە)و (وەرگێڕدراو)ن !! گوایا، هێنان، یاخود بە کارهێنانی دوو وشەی هاوواتا، بۆکاری رەوانبێژی یە، یان بۆ جوانکاریی، یاخود بۆچی ! جگەلەمەش کەی کورد وتوویەتی (کورچ وکاڵ) ؟ بەرهەرحاڵ ئێستە دەبێ روون بکرێتەوە ماموستا خۆی بۆ ئەوەی رستەکەی بەم جۆرەی لێ بکات و تاوەکو (کاڵ وکورچی) نەمێنێ.

(واهەست دەکەم، کەوەرگێڕدراوێکی کاڵ و کورچە).

هەر لە بەر ئەوەی، کە کاك حەمەعەلی ناوی تەرجومەی هێناوە، وا وێنەیەکی خۆی دەهێنینەوە، کە سەرانسەرو دەقاندەق تەرجومەی عەرەبی یە ! ئەویش ئەمەیە: «لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا هەندێ بابەتی وەك... تۆمار دەکات» هەروها دووربارەو سێ بارەی کردووەتەوەو وتوویەتی: (لە ژێر ئەم ناوونیشانەدا بەحەوت دێڕ لە ژیانی شاعیر دەبێتەوە).

لە کوردەوارییدا، دەڵێن: (فلانکەس کوڕێکی بووو ناوی نا، شاهۆ - بۆ وێنە). هەر وەها دێژن؛ (فلانکەس کوڕەکەی بە ناوی شاهۆوە ناو ناوە)، هەرگیز

نەوتراوەو ناشوترێ ـ جگەلەوانەی کە رۆشنبیریی یەکەیان هەر لە بنەڕەتەوە عەرەبی بووەو لەم ئاخرە ئۆخرەدا لایان بەلای رۆشنبیریی کوردیدا کردووە ـ لە ژێر ناوی شاهۆدا ناو نراوە !

بەهەر حاڵ، کێشەکە وا لەوەدا، کە زمانەکەی کامەحەمەعەلی زمانێکی بنەڕەت عەرەبیە بۆ کوردیی وەریدەگێڕێ.

**ء ـ دەربارەی نیشتمانپەروەری میرزا ئۆ لقادرەوە.**

کاک حەمەعەلی، ناچەقێتەدڵی، کە میرزا ئۆلقادر نیشتمانپە روەر بووبێ، ئەمەش ڕێی تێدەچێ، چونکە هەرکەسێ جۆرە دووربینێکی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ بینینی ئەو جۆرە شتانە.

من، بەش بەحاڵی خۆم، بەلامەوە وایە، کە هۆنینەوەی جەنگنامەی کوللەو ئاینەمەل خۆی لە خۆیدا ئیبداعێکی ئەو بارەی ئەو وەختەبووبێو لە کوردیشدا ئەوە یەك ئەدەبی رەمزییو بەوجۆرە فراوانیەو بەو پڕواتایەوە دەنگ وباسی بەسەر هاتێکی ناوچەکانی کوردستانمان بۆ بگە ڕێنێتەوە.

ئەوجا، ئەگەر کاک حەمەعەلی ئەدەبی رەمزییی کوللەوئاینەمەل، کە بە بەرهەمی نیشتمانی نەزانێ، ئەوەدەسەلاتی من نییە !!!

**هـ ـ دەربارەی سەرچاوەوە.**

خوێنەر دڵنیا ئەکەم لەوە، کە جگە لەو سەرچاوانەی کە لە دواێنو پەراوێزی نێو مەتنی بەرهەمەکەو سە رچاوەکانی دیکەدا کە لە لاپەڕەی سەرچاوەدا تۆمار کراون سوودم لە هیچ سەرچاوەیەکی دیکە وەر نەگرتووە، ئەوجا لێرەدا ئەم کورد واتەنیە بێنینە مەیدانەوە، کە دەڵێ:ـ (ئاش کاری خۆی دەکاو چەقچەقەش سەری خۆی دێشێنێ !)

دەربارەی، ئەو خاڵەوە، کە ناوی سەرچاوەی (خورشیدو خاوەر)م نە هێناوە، لە وانەیە مامۆستا لەکاتی (بێئیختیار) یەکەیدا نەیتوانیبێ بیبینێ، لەبەرئەوە وای بە باش ئەزانین، کەئاگادرای لاپەڕە (٢٥)ی داوێنی (میرزا ئۆلقادر) بێو ئا لە وێدا، سەرچاوەی (خۆرشیدو خاوەر) مان بە پامانو زامانی داناوە.

کاک حەمەعەلی، باسی خراپلێکدانەوەی هەندێ وشەی وەك (عاد)و (صالح) دەکاو بەم بۆنە شەوە هەندێ وشەی (سووکوخوارکەر) بەمەبەستی لۆمە کردن بەکاردەهێنێ. بە هەرحاڵ، ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ دەوترێ، کەبێژین، ئەگەر کاك حەمەعەلی لە قامووسی (المنجد)، رازیی نییەکە وەك سەرچاوەیێ وەرگیرێ، من بەش بە حاڵیخۆم، زۆر پێی رازیم، ئەگەر مەبەستیشی

هێنانەوەی ئایەتی قورئان بێ، لەورووەوە، من وەك ئەو ئەرکی سەر شانم نەبووە. کە ئایەتی قورئان لەبەر بکەم.

## و ـ بەنسیبەت جۆری رێنووسی (خ) و (غ) وە.

**لەم رووەوە کاکە حەمەعەلی وتوویەتی: «نازانم، هەورامانی، نەخۆشی گۆڕینی (غ) بە (خ) یەتی....».**

هەربۆ موناقە شەکردن، من ئەم گۆتەیەی ئەوم بۆ وێنە گرتنەوە، تاوەکو خوێنەریش و ماموستاقەرەداخی خۆیشی، پاش بەسە رچوونی (بێئیختیاریەکەی)، بەسەری دا بچێتەوەو ئەگەر بۆیشی کرا، بەراوردێکی ئەم رێبازی رەخنەسازیەی خۆی، کە گرتوویەتیەبەر، لەگەڵ رێبازی قوتابخانە جیهانی یەکانی رەخنەسازیی دا بکات و هیچ نەبێ نەختێ خۆی لێیانەوە شارەزا بکات ! ئەگەرچی راستەوراست قسەکەی لەگەڵ منە، بەلام کۆری زانیاریشی گرتووەوە، چونکە هەر کۆڕیش لە تەقلو دەوی کێشەی رێنووس و جۆری رێنووس دا دەر نەچووە، هەروەها زوربەی نووسەرانیشی گرتووەتەوە، چونکە کەس نە یتوانیوە تاقە وشەیێ هەموو جارێ بەیەك شێوە رێنووس بینووسێ و یەکێ لەوانەخۆیشی.

بەلام، دەربارەی بەکار هێنانی پیتی (خ) لە جێگای پیتی (غ)ی کاك حەمەعەلی دا، بەلایمنەوە بۆ هۆی بنەرەتی دەگەرێتەوە. بۆ وێنە، وشەی قەرەداخ، وشەیەکی لێکدراوی تورکی یە، تورکەکان خۆیان، بەرێنووسی لاتینی بە پیتی (خ) دەینووسن، چونکەبە دەنگی [خ]ی گۆدەکەن، ئەگریش، ماموستا، بە زۆرە ـ ملیبە پیتی (غ) دەینووسێ ئەوە پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە.

وشەی (پەیخام)، لە ناو کۆمەڵگای کوردەوارییدا، بە واتای (هەواڵ)و (نامە)و (ناوونیشان) بەکار دەهێنرێ.

وشەی (بەر) یش لە رەگی چاووگی (بردن) ەوە وەرگیراوە. بە لێکدانی هەردووکیان (پێخام + بەر)، دەبێ بە (پێخامبەر) یاخود (پێخەمبەر)، کەواتای (نامەبەر) و (هەوالبەر)و (ناونیشانبەر) دەدات، لەگەڵ ئەوەش دا زۆربەی نووسەرو کاك حەمەعەلیش بەم جۆرە (پێغەمەر = پێغەمبەر) دەینووسن و کەسیش ناتوانێ بلێ: نابێ وەها بنوسرێ، چونکە کێشەکە دەبرێتەوە سەر رێنووس.

## ز ـ سەربارەت بە جۆری لێکولینەوە.

هەندێ کەس، هەرئەوەندەی لێ دێ، کە رەخنەی رەشبینی خۆی بگرێو

بڕوا بەسەردا، بەبێ ئـەوەی بتوانێ بـەڵگەیی بـە دەستەوە بـدا، یارێنمـایی ڕێگایەکی باشتر بکات !

ئەوجا لەم دەرفەتەدا، دەبێ ئەوە دووپاتبکەمەوەو بڵێم، ئەگەر هاتوو وەك ئەرك سەر لە نوێ، لێکۆڵینەوەی میرزا دراوە بەسەرمدا هەر هەمان ڕێگە دەگرمە بەرو هۆکەش لە پێشەکی بە رهەمەکەدا ڕۆشنە.

ح - لە بارەی نرخاندنی بەرهەمی میرزائۆلقادرەوە.

لێرەدا، تەنیا هەر ئەوە دەڵێم، (لەوە دەکات)، کە (کارتێل وتریستاتی) ئە دەبی دروست بووبێ، بۆیە نەزانراوەو نازانرێ، چۆن تاڵە دەزووری هێلانەی جاڵجاڵۆکە لەوێوە هاتووەو بەو (کەس نەزانیە)دا تێ پەڕیوە !!

ناشوکریی نەبێ، ڕۆشنبیرە هەورامانی زانە ئەدەبدۆستەکان زۆر کەمن و ئەتوانین بڵێین، کەلەشێخ ئەمین نەقشبەندیو حەمەکەریم هەورامی وعوسمان هەورامی بەولاوە هێشتاکەسی دیکە سەری هەڵنەداوە.

لە لایەن دەزگارۆشنبیری یە کوردی یەکانیشەوە، هەر بۆ سوودی گشتیی و سوودی خۆشیان، زۆرکەم بیریان لەو کورد واتەنیە کوردی یە کردووەتەوە، کە دەڵێ: (نان بۆ نانەواو گۆشت بۆقەساب)، زوربەی وەخت لەو ڕووەوە کەوتوونەتە دوای ڕازەکورەوەاریەکان، کە ئەوەی بۆ ئەم شیاوە لەبەر ئەوەدا دانراوە کە بۆی نەشیاوە، بێگمان، کردەوەی وەها جێگای لۆمەیە.

بەهەرحال، بەرهەمی میرزا ئولقادری ئێمە بە (مـامۆستـا مەلا جـەمیل ڕۆژبەیانی) درا ئەگەرچی ئێمە خۆمان وا پێشنیازمان نەکردبوو !

مامۆستا مەلا جەمیل - یش، هەرچی (ی) ی ئیزافەو ڕاناوی (یی) هەبوون سـەرپاکی بـەڕاستو چەپ داپـاچیون، هـەر وەك سەرپـاکی ئەو بـەرهەمـە هەورامانی شێوەزارانەی کە لە مەوپێشتر بڵاوکراونەتەوە.

منیش لێرەدا دوو دڵم، ئەو کارەبدەمە دواوە یا بڕوا باشە !! هەر لەبەر ئەوەی زۆر لام ئاشکرایە کە ئەگەر هاتوو ئەم داپاچینەم دایە دواوە کەس بڕوای بەڕاستی من لەم ڕووەوە نییە، بـۆچی ؟ چونکـە بۆچی !! جـا لە بەر ئـەوەی، کەبوون لە نەبوون باشترە پێم نا بە جەرگی خۆمداو پێی ڕازی بووم.

ئەوجا سەیر ئەوەیە، کاك حەمەعەلی، لە سەرێکەوەلێی ڕازی نییە کە من زۆر لێی ڕازیم و لە سەرەکەی ئەویشەوە من هەر بە پێچەوانەی ئەوەوەم.

# نەناسراوی ئەدەبی کوردیو سێ دەسنووسی

**محەمەد عەلی قەرەداغی**

## دەسنووسی یەکەم
## ( هەفت لەشکر)
## دانراوی مصطەفا کوردستانی

لە ژمارە ۱۹۰۷ی رۆژی ٤ / ۱۰ / ۱۹۷۹ی رۆژنامەی (العراق)ی عەرەبیدا وتارێکم بە ناونیشانی «العثور علی مخطوطة **(هەفت خوان)**»بڵاوکردەوە.

لەو وتارەدا موژدەی دۆزینەوەی نوسخەیە کی ئەو کتێبەم بە خوێنەران داو، بایەخی ئەو دەسخەتەیش – بە لای منەوە – زیاتر لەوەدا بوو کە بە دەقە گۆرانی یەکە بوو و،وەرنەگێڕرابوە سەر شێوەی سۆرانی.

ئاشکرایە دۆزینەوەی هەر نوسخەیەکی دەسنووسێکی کۆن کلیلی دەرگای باسو بابەتێکی تایبەتی یەو، لەوانەیە کلیلی گەنجینەیەکی شاراوەیش بێت. بۆیە هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بووم کە هەر دەسنووسێکم دیبێت بە هەر شێوەیەك بۆم لوابێت کارێکی وا بکەم یان دەسنووسەکە چنگ بخەم، یان وێنەیەکی لەبەر بگرمەوە، یان هەر نەبێ کارێکی وا بکەم خاوەنەکەی لە رادەی نرخو

بایەخی دەسنووسەکە بگەیێنمو وای پیێ بکەم ئەویش نرخی بزانیێو بێ پاریێزیێو لە ناوی نەدات.

لەم ماوەیەدا لە سلێمانی چومە لای کتێب فرۆشێكو سێ دەسنووسی کۆنی پیشان‌دام، بێ ئەوەی زۆر لێیان وردبیمەوە، بەو نرخەی داوای کرد، دەسخەتەکانم وەرگرتو لەگەلێ خۆم هەڵگرتن.

دوای سەرنجدانو لیێوردبوونەوە بۆم دەرکەوت چەند بەشێکن لە شانامەو بە شێوەی گۆرانی بە شیعر کراون بە کوردیی.

لە بەر ئەوەی وەك موژدەیەکی دیکە بدەم بەوانەی خەریکی لێکۆڵینەوەی سامانی کەلەپووری ئەدەبی کوردین دەرفەتم چنگ خستو رزم‌پێداگرتنو موژدەی یەکەم دەسخەتی یەکەم پێشکەش کردن :

سەربازێکی گوم‌ناوی ئەدەبی کوردی ..

ئەو کاتەی کە موژدەی دۆزینەوەی دەسخەتی «هەفت خوان»م بە خوێنەران دا .. دانەری ئەو کتێبەم نەزانی .

کاتێکیش مام نووری سەعید ئیبراهیم بە برای بەنرخم مامۆستا عوسمان هەورامی گوتبوو : دانەری (خورشیدو خاوەر)و(محەمەدحەنیفە)و .. مصطەفا وەلی‌ی کوردستانی‌یە مامۆستا عوسمان ئەو هەواڵەی بە گومانەوە وەرگرتبوو [1] بەڵام وا بزانم مام نووری سەری تاڵەدەزووەکەی بە رێکی داوەتە دەست کاك عوسمان چونکە ئەم دەسخەتەی من لێرەدا باسی لیێ دەکەم بە شیعری ئەو سەربازە نەناسراوە ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە کە ئەو شاعیرە بەرزە شانامەی بە شیعر کردوە بە کوردیو لە کۆتایی (رەزمی هەفت لەشکر)ەکەیەوە بەم شێوە دەدویێ :

ئاگات جە وێت بۆ (مصطەفا)ی سەرشێت
ئەی دنیا هیچەن بواچوون پەرێت
تۆشە بسازە پەریێ قیامەت
تا رۆز مەحشەر نەبی خەجاڵەت
یاران یاوەران دنیا فانی‌یە
تەصنیف (مصطەفای کوردستانی) یە

بەڵام ئەم مصطەفایە کێیە ؟ کوری کێیە ؟ کەی لە دایك بوە ؟ لە چ

هەستەکا مروڤایەتی یا بەرز یا نزمك هەی.. نێ پشکێد دوزەخێ نە ل نك مە بتنێ هەنە، ل گەلەك وەلاتێد جیهانێ یێد هەین، هەر وەسا ئەڤ بچویکێ هەنێ یێ کورد، نمونەیە بو گەلەك ملیونا بچویکێد وەکی وی د جیهانا (پێشکەفتی‌یادا) !!.
وەکی من ل سەری گوتی، ئەڤ چیروکە یێد ئێك دەراڤدا د خەبتنو بەرەڤ ئێك ئارمانج دچنو سەقایێ (مناخ) وان ئێکە؛ ئان ژی نێزیکی ئێکە، هەرسێکا ب دانو ستاندنا دناڤبەرا کەسادا هزرو بیرێد خو ب رێزکرن و روی ب روی دگەل خواندەڤانی د ئاخفتن.
ـ لەتیف ـ دچیروکاخودا بە حسێ پشکەکا دوزە خێ دکەت، هەروەسا جە هـ د چیروکا.. ـ سەبری ـ دا پشکەکا دوزەخێ‌یە، بەلێ هێژ قارەمانێد ـ سەبری ـ نەچوینە بەحشتێ.
وەکی ـ لەتیف ـ قورتال بونا ژ بەندیخانێ ومرنا مروڤی دکەتە بەحشت ئەم دبینین ـ سەبری ـ ژی یێ ل گەل وێ چەندێ دەمێ چەلەنگ دبێژت «هەموو خەلکێ ڤێ دنیا گەنی‌بووی ژمرنێ درەڤن ومرن ژمن درەڤێ، من ئەو دڤێت و مرێ ئەز نەڤێم». ل ڤێرێ یا ئەشکەرایە (چەلەنگ) ی مرن خوشتر دڤێت ژوێ ژیانا ئەو تێدا.
دچیروکا ـ لەتیف ـ ی دا، بچویکێ بێ باب.. یێ باب کوشتی، یێ خەونا ب بابێ خوڤە دبینت، هەر وەسا دچیروکا ـ نجیب ـ ی دا کچکەکا بچویك یا باب کوشتی، یا دخەمێد دویرکەتنا بابێ دا دژیت.
ـ نەجیب ـ دچیروکا خودا دبێژت «... ئەڤ ئاقارێ «هشك وسوتی» وەسا ڤیڤی پێڤە هاتبو تایێت دارا چوبونە د ناڤێکرا، ببو دارستانەکا تاری‌و گەلیێ گوندی تژی خەمل‌و خێرو خوشی کربون زەڤی ژی هەمی کربونـە دەخل‌و دان گوندی پێ شاد ببون» ئەڤە بەری باب ب هێتە کوشتن و ئاقار ب مینت «هشك و سوتی»، هەر وەسا ـ سەبری ـ ژی دبێژت کو ئەڤ تشتێد بوینە خەیال ل دەڤ (چەلەنگ)ی:ـ «خەون‌و خەیالێن کوچەرێن خودێ هەر هەمو چەرو مێرك‌و پاوان‌و چیرەیە ئەزبەنی، لەو چیروك‌و سەرهاتی‌یێن مەژی پێتر ل سەر بارکرنێن مەنە، هەموو بەر بهاری‌و دەشت‌و زوزانن ئەزبەنی» ئەڤەژی حالێ (چەلەنگ)ی بو بەری ب کەفتە د پشکا دوزەخێ دا. (دایك) دچیروکا ـ نەجیب ـ ی دا یـا ب هیڤی‌یە «تڤەنگا بابێ تە بسنگی ڤەرزی یا ل ژڤانا تە..»، هەر وەسا ـ چەلەنگ ـ ژی دویماهیا چیروکا ـ سەبری ـ دبێژت (گوپالەك ئاسن بومن پەیداکن«، دیسا (باب) د چیروکا ـ لەتیف ـ ی دا، د کورێ خورا دبینیت ئەو ژی دێ رێکا وی گریت «بەلام دلنیام با خوت گەورە بی ناوی هەموویان فێر دەبێ وبو کورەکەی خوت باسی دەکەی». هیڤیێد هەر سێ چیروکا دپری خەبات‌و شورەشن.

هەمی گاڤا مە ئەڤ هوزانڤانە یێد دیتین، دقەبین وەکی کەوێد کومتێد بلند..
وئەڤروکە دیسانێ یێ ب دەنگەکێ بلند دقەبن، بەلێ ب ئاوازەکێ دی.. دبت یێ
خوشتر... شرینتر.

ل دویماهیێ من دڤیت ئەز دگوهێد هەرسێ هوزانڤانێد خودا بێژم.. «گوتنێد
هەوە شەکر بون.. دەستێد هەوە د خوشبن بەسەر وان هوزانێد هەوە
ڤەهاندین... ببورن... وان چیرۆکێد هەوە ڕاچاندین...».

—— O ——

# چەند راستی‌یەك بۆ راستكردنەوەكانی هەڵگورد

هێرش محمد أمین

ژمارە دووی گۆڤاری ئۆتۆنۆمی‌ی سالی 1985 . . لە لاپەرە هەشتاو یەكیدا . . بەناونیشانی (راستكردنەوەیەك لە بارەی عەلی مەردانەوە) باسێكی بۆ هەڵگورد ناوێك بلاوكردۆتەوە بەو ئامانجەی لە پلەو پایە بەرزەكەی ئەم هونەرمەندە مەزنە كەم كاتەوە.

ئەو قسە بی‌كەڵك و پر كینانەی هەڵگورد چرنووك بە شاخەوە نانە . . ناتوانن تۆزقاڵێك لە مەزنی مامۆستای جێی شانازی عەلی مەردان كەم كەنەوە.

رەسەنی‌و مەزنی بەرزی عەلی مەردان لەوە دەرچووە قسەی لەبارەوە بكرێ . .

ئەم هەڵگورد ناوە گەر بروای بە قسەكانی خۆی هەبوایە بەناوی ئاشكرای خۆی . . خۆی دەرئەخست.

لەگەڵ رێزم بۆ دەستەی نووسەرانی گۆڤاری ئۆتۆنۆمی كە ئەبوو خاتری پایە بەرزەكەی مامۆستا بگرن و رێگا نەدەن ووتاری وای لەسەر بلاوبكرێتەوە . . بیانزانیایە هەڵگورد ئەم زانیاری‌یانەی لە چ سەرچاوەیەكەوە وەرگرتووەو لە كوێوەی هێناون.

هەروەكو ئەزانین لە هەموو گۆڤارو رۆژنامەكاندا پێرەو كراوە هەموو بابەتێك پێویستی بەسەرچاوەو روونكردنەوە هەیەو بەتایبەتی ئەم بابەتانە كە ئەم ناوی لێ‌ناوە راستكردنەوە.

ئایا ئەم بابەتانە چ سوودێك بەهونەری كوردی ئەگەیەنن؟

هونـەرمـەنـدێـك بڵێت (بـۆیـە حەز ئەكـەم زۆر بژیم بۆ ئەوەی بتوانم زۆر تر خزمەتی هونەری گۆرانی كوردی بكەم)[1] شایانی پەیكەرو رێزو یادكردنەوەی ساڵانە نییە؟

حەزم كرد چەنـد شتێ روون كەمـەوە بۆ خوێنـەران و بەڵكـو هەڵگـوردیش تۆزێ شارەزایی پەیدا بكـات وەك لە نووسینـەكـەیدا دەرئەكەوێت هیچ شارەزاییەكی دەربارەی باسەكە نی‌یە بۆ ئەم مەبەستە بێجگە لە خوێندنەوەی هەر دوو بەرگەكەی (گۆرانیەكانم) پەیوەندیم بە (عبدالقادر) كوری خوالێ خۆشبووەوە كردو هەندێ زانیاریشم لەو وەرگرت.

كە هونەرمەند علی مەردان كۆچی دوایی كرد تەلەفزیۆن و ئیستگەو گۆڤارو رۆژنامەكان چ عەرەبیەكان چ كوردییەكان و لە چلەكەیداو لە یادی ساڵانەیدا زۆریان دەربارەی ووت و بلاوكـردەوەو بایـەخێكی زۆری پیٚدرا ،بـەڵام وا دەرئـەكـەوێت هەڵگـورد بەم نووسینـەی ئەیـەوێت لە پلەی علی مەردان نزم كاتـەوە، وەكـو دەرئـەكـەوێت لە رۆشنـایی ئەترسێت لەوەدا ناوی خۆی بە تەواوەتی نەنووسیوەو وا دیارە لە نووسینكەی دڵنیا نەبووە... یاخود بۆ پركردنەوەی لاپەرەیەك لە گۆڤارەكە بووە..

(ئـەم هەڵگـوردە)ە وەكـو خۆی بەنـاوبـراو ئەڵێت (ئـەم علی مەردان)ە لە سەرەتاوە بە هەڵەدا چووە وەك ئەڵێت (علی مەردان خەڵكی دەوروبەری هەڵەبجە بوو ساڵانی سەفەر بەلك و گرانی گەورە «1914 ـ 1920» زۆر لەكوردانی لە گوندو دێهاتی تەرتەوەرتە كرد)[2].

ئەدیب و رۆژنـامـەنـووس برهـان قانـع ی خوالێخۆشبوو لە بەرگی یەكەمی كتێبەكەی (گـورانیـەكـانم)دا ئەڵێت: «بـەپیٚ‌ی زاری خۆی لە ساڵی 1904دا لە شاری كەركـوك لەدایك بووە، لەگەرەكی تەكیە تەكیەی شێخ عەلی تاڵەبانی ـ )[3]

هەروەها هونەرمەند خۆی ئەڵێت: (من لە شاری كەركوك هاتوومەتە دنیاوە لە گەرەكی تەكیـەی شێـخ عەلی تاڵـەبـانی. رەحمـەتی خوایان لیٚ‌بیٚ باووباپیرانم كانی ساردین)[4] ،ئـەگـەر وا نییـەو ئەم زانیـاریـانـە هەڵـەیـەكی تیا بووایە لە ساڵی (1981)ەوە ئەو كتێبە (گۆرانیەكانم ـ بەرگی یەكەم) دەرچووە یەكێك نەبووە لەنگی لەم زانیاریانە هەبوو بێت.

هەڵگورد ئەڵێت (بەناوی كورە شێخیەتی‌یەوە دیوەخانەكەی ناو نابوو تەكیە، ئەوەش ئاشكرایە كە بە كوگای «دەروێش» ئەوترێ «تەكیە»و بەكوگای «صوفی» ئەوترێ «خانەقا»)[5]

لێرەدا دەرئەکەوێت کە نوسەر هیچ شارەزاییەکی نی یە چونکە تەکیە دیوەخانی تاڵەبانیەکان نەبووەو تەکیەشیان لە لەیلان نەبووە بەڵکو دیوەخانیان هەبووەو تەکیەکەشیان ئیستاش ماوە لە کەرکوك مزگەوتیشەو گەڕەکەکەش هەر بەو ناوەوە ناسراوە لەسەر رێگەی سلێمانی یە بەرامبەر گەراجی سلێمانی و هەولێرو موسڵ، هەر کەسێك شارەزای ئەو ناوچەیە بێت ئەوە ئەزانێت ئەبوایە هەڵگورد لە جیاتی [کوگا» شوێن یاخود جێگای بەکاربهێنایە چونکە کوگا (معرض یا محل)ی عەرەبی ئەگەیەنێت.

هەرودها ئەڵێت (ئەم کوڕە ـ عەلی مەردان ـ لەو تەکیەیە خزمەتی ئەکرد)[6].

بەڵام برهان قانع لە کتێبەکەیدا ئەڵێت: (سەرەتا دەستی بە خوێندن کردوە لە حوجرەی تەکیەی شێخ عەلی تاڵەبانی و هەر لەوێ قورئانی خەتم کردوە، دوای ئەوە گولستان، بوستان، ناگەهان ئیسماعیل نامە، باغەبانی و چەند کتێبە وردەیەکی سەرەتایی تری بە فارسی و تورکی و عەرەبی خوێندوە)[7].

وەکو لێرەدا دەرئەکەوێت ئەمە پێچەوانەی نووسینەکەی هەڵگوردە ئەگەر وەك ئەو ئەڵێ (خزمەتکار) بوایە ماوەی نەئەبوو بخوێنێت و قورئان خەتم بکات و ئەگەر هاتوو ئیشیشی لەو تەکیەیە کردبێت عەیبە نەبووە چونکە ئەو کەسەی ئەچێتە ئەو شوێنانە بەهەر فرمانێك هەستێت وەکو جاران باوبووە بەخواپەرستیان داناوەو شەرمی تیا نەبووە، جا ئەگەر علی مەردانیش لە حوجرەی ئەو تەکیەیەدا بووبێت و خزمەتی کردبێت وا بزانم لە کەسایەتی علی مەردان کەم ناکاتەوە.

هەروەها لە لایەکی تردا ئەڵێت (کچی کابرایەکی تورکمانی لەیلانی حەزی لێ‌کرد بوو، شەو چوو بووە سەری، باوك و برای کچە لێ‌ی بەخەبەر دێن و دەیدەنە بەر گوللەی تفەنگ)[8].

لە لێدوانێکی هونەرمەند لەسەر کاسێت بۆ ئیستگە لەگەڵ مامۆستا کمال رؤوف محمد[9] تۆمارکراوە هونەرمەند باسی یەکەمین خۆشەویستی‌یە پاك و بێگەردەکەی لەگەڵ (لیلانی قەزی) ئەکات، ئیتر ئەمەی هەڵگورد ئەیڵێت تا ئێستا کەس باسی لێوە نەکردوە... و نازانین سەرچاوەکەی چی‌یە.؟

هەڵگورد ئەڵێت: (هنیدی ئەو حەلە لەشکرگای «لەبیّ‌ی ئینگلیس» بوو لەوێ بوو بوو بە کارەکەر)[10]

هەروەك لە عبدالقادری کوڕیم پرسی دەربارەی ئیشکردنی باوکی لەو شوێنە وتی راستە ئیشی کردوە بەڵام کرێکار بووە، هەروەها علی مەردانیش ئیش کردنەکەی

نەشاردوویەوە بەڵام ناوی سوێیەکەی نەهێناوە وەك ئەڵێت: (. . . بابی دووبارە گەڕاوە بۆ بەغـدادو دەستم کرد بە فرمـان کردن)[11] کاك هەڵگـورد هەروەك لەسـەرەتـادا ووتم هیچ شارەزاییەکی لە زمـانی کوردیدا نییـە لە جیـاتی «خزمەتکار» «کارەکەری» بەکارهێناوە چونــکــە «کــارەکــەر» بۆ ئافرەت بەکارئەهێنرێت لە ماڵاندا کار بکـــات هەروەها لە نووسینی ئەمرۆماندا«ئینگلیز» ئەنووسرێت نەك «ئینگلیس».

هەڵگورد ئەڵێت «یەکەم گۆرانی خۆی بە تورکمانی بلاوکردەوە «گوێزم لەیلانلی قزی»)[12] بووە بەڵام راستیەکەی یەکەم گۆرانی کوردی مامۆستای خوالێخۆشبوو مەتامی ئەڵـلاوەیسییـەوە (قـەوانـەکـەشی لای عبـدالقادری کوڕی هەیەو بەروارەکەشی لەسەرە) یەکـەم گۆرانی تورکیش ئۆرفـەیـە کە لەسـەر قەوان تۆمـار کرابێت هەروەك لە کتێبـەکەیدا هاتووە ئەڵێت: (ئینجا ئۆرفەو قۆریاتی تورکیو مەقامی کوردی ئەڵلاوەیسی لەسەر قەوان تۆمار کردوە)[13].

هەڵگورد ئەڵێت (بۆ یەکەم جار علی مەردان «خورشیدی» یەکی تۆمار کرد)[14].
بەڵام خوالێخۆشبوو علیمەردان ئەڵێت (ئەوەڵ گۆرانی مەقامم لە ئیزگە ئای ئای بووە)[15].

لە کۆتـاییـدا هەرئـەوەنـدە بەسـە بڵێین علی مەردان هەر علی مەردانـە. . . (لەساڵی 1932 لە قاهیرە بەشداری ڤیستڤاڵی یەکەمی مۆسیقای عەرەبی کردوەو قەوانــەشی تــا ئێستــا ماوە)[16]

(یەکەم کورد بووە کە لە ساڵی 1948دا لە ئیستگـــەی رادیـۆی لوبنـان و ئوردن و شام دا بەکـوردی ئاهــەنگی گێـڕاوەو سروودی نیشتمـانیووتـوەو هانی لەشکریدژ بە ئیمپریالیزمی داوە)[17].

---

**سەرچاوەو پەراوێزەکان**

---

1 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم 1981 ل15 دا

2 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 1985/2 فل81 س1 دا

3 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل5 د1

4 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل21 د1

5 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 2 ـ 1985 ل81 س1 د8

6 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 2 ـ 1985 ل81 س1 د11

7 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل6 د6.

8 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 2 ـ 1985 ل81 س1 د33

9 ـ کاسێتەکە لای عبدالقادری کوڕی خوالێخۆ شبووەو لە ئیستگەش بڵادکراوەتەوە.

10 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 2 ـ 1985 ل81 س2 د8

11 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل28 د2

12 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ل81 س2 د12

13 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل11 د5

14 ـ گۆڤاری ئۆتۆنۆمی ژمارە 2 ـ 1985 ل81 س2، د16

15 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل28 د16

16 ـ ئەم وتەیەم لە عبدالقادری کوڕی خوالێخۆشبووەوە وەرگرت و وتی قەوانەشی ماوەو بەراوکەشی لەسەرە بەستەی قەوانەکەش ئەمەیە:

چاو جوانە روومەت پانە
ماچێکمان بەرێ جەژنانە

17 ـ گۆرانیەکانم بەرگی یەکەم ل11 د14

ل: لاپەرە، س: ستوون، د: دێر

# لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافیایی

کەریم زەند

لە گۆڤاری کاروان ژمارە ١١ ئابی ١٩٨٣، کورتەیەك دەربارەی مێژووی لوڕو لوڕستان لەلایەن کاك یوسفەرەئوف عەلی یەوە نووسرابوو، سەرنجی ڕاکێشامەوە بۆ نووسینە جوگرافیاییەکانی هەرێمی خاوەری کوردستان و، ناوچەیەکی گرنگی کە بە نەوازوشەوە پێش کەشی خوێنەرە بەڕێزەکانی دەکەم بەسوپاسەوە.

## ناوچەی لوڕستان ـ

لوڕستان کەوتۆتەخۆرئاوای ناوچەی شیرازەوە ناوچەیەکی شاخاوییە، کێوەکانی لەباکووری خۆرئاواوە بۆ باشووری خۆرهەڵات ڕاکشاون، لوتکەکانی بەفر دایپۆشیوە، بەهۆی زنجیرە چیاگەورە ڕاکشاوەکەیەوە، لوڕستان کراوە بە دوو بەشەوە ـ

١ ـ پێش کێو ـ بەشی خۆرهەڵاتی

٢ ـ پشت کۆ ـ بەشەکەی تری کە پاش کێوە

ڕووباری کەرخە لە لوڕستانەوە تێ ئەپەڕێت و ئەڕژێتە زۆنگاوی حوێزەوە

دەرەکانی زۆر بەرز نییە بۆ کشتوکاڵ دەست ئەدات لە باشووی خۆراوای (برۆجرد)ەوە لەوەڕگای خۆشی هەیە، چیمەنی پڕ ئاوو پووش و پاوەنی زۆرە.

لە شارەکانی ئەم ناوچەیە خوڕەمئاوایە بنکەی لوڕستانە لەنێوانی ڕۆخانەو شاخێ سەخر دایە، دزەڕەش سەرچاوە ئاوێکی خۆشە جێگای سەردارانی ئەتابیگانی لوڕستان بووە، دووژی فەلەکی ئەفلاك قەڵایەکی بەرزی قایمە یادگاری شاپووری زولئەکتاف ساسانی یە بەشێکی ئەو ناوچەیە، بەهۆی کێوو ڕووبارو چاووگەوە ئاووهەوای خووڕەمئاوا خۆش و سازگارە باخی پڕ درەخت و دیمەنی جوان و دڵفرێنی هەیە ڕۆشنگەیەکی بەرزی هەیە کوڵەکەکانی مەڕمەرە لە شوێنەواری سەلچوقیەکانە.

بروجرت - بنکەی پارێزگای بروجرتە، ئایندەیەکی بازرگانی و پیشکەوتوویی هەیە، لە شوێنە بەناو بانگەکانی سیلاخوڕی ژووروو ژێرووە لە تەك چاپلك -

گەلی نیشانەی قارەمانێتی فەیلیەکان لە نووسراوە مێژووییەکاندا دەرکەوتووە کە لە دەربەندی مانرووەدەوە هاتوون.
ئەستەخری - ئەلێ - دێزفول بە ناوی شاری لوڕەوە ناونراوە، لوڕیش چوار بەشن.
مامەسانی - کۆگلۆیی - بەختیاری - لوڕی بوومی. دوکتۆر فریج، لوڕەکان بەکورد دائەنێت، هەروەها سێرجۆن مالکوم، براون، لوریا، هاسل، گەریدە ریچ، لوڕی گەورەو بچوکیان بە کورد داناوە هەروەها مێژوو نووس عوسمانی هەر هەموو لوڕی بەکورد داناوە، لە تەك بەختیاری و گۆران و لەك و زەند، هەموویان لە یەك توخم و هۆزن.

چیاکانی لوڕستان، جەنگەڵ و لێرەوار دایپۆشیوە، دەشتی فراوان و بچووکی تێدایە، رووبارەکانی باکوورو خۆرئاواو باشووری ئەڕژێنە رووباری سیامەرەوە رووباری کەشکان، تەواوی دالەوەندو هەردو سلسلەو تەرهان ئاودێر دەکات و دەڕژێتە رووباری سیامەرەوە، رووباری زاڵ، بەشی زۆری لوڕی گەرمیان ئاودێر دەکات، رووباری سزا هەموو سیلاخوڕو پاپی و بەشێ لە سەگەوەندو پاپی گەرمیان ئاودێر دەکات، رووباری بلا هەموو مەنکرە - گەرکی، ئاودێر دەکات.

رووبەری لوڕستان ٦٠ هەزارکم٢، مۆناتی نزیکەی ٣ ملیونە، بە ئاژەڵداری و کشتیاری وە خەریکن سوود لە جەنگەڵ و کانەکان وەردەگرن.

١ ـ رێگەی خورەمئاباد ـ دیزمۆل ـ پردی زاڵ، خورەمئاوا ـ شاهەنشا ١٨کم ـ چەشمەك ٣٠کم ـ ئاوسارد ٢٤کم ـ میشەوەند ٢٤کم ـ ئاوگڵ ٨کم ـ پیرنچکار ١٨کم ـ پردی تەنگ ٦کم ـ پردی زاڵ ١٥کم ئەبێت.
٢ ـ رێگەی کەلۆر ـ چەشمەك ٤٨کم.
٣ ـ ئاوسارد ـ چەشمەك ١٠کم
٤ ـ رێگە بۆ قەڵا مۆرتی ٢٧کم ـ تەنگخۆشاب ١٨کم ـ ئاب گل ٢٤کم ـ کەڵکی ١٨کم ـ مەنکەرە، لەملەی چاوێنەوە ٢٤کم ـ قەڵای پر دی زاڵ ٢٤کم، کەڵکی ـ قەڵای پردی زاڵ لە روونی و چاونی و کێوی چنارەوە ٢٤کم، پردی زاڵ ـ مەنکەرە ٣٠کم، کەڵکی ـ قەڵای سیامەرە لە سەربازگەی چایدرەوە ٣٦کم.
٥ ـ رێگەی سەربازگەی جابدر ـ سیامەرە ٣٦کم، قەڵای سیامەرە ـ ئاودانان وملەی دار هۆ ٤٢کم، چایدر ـ گاومیشان ٢١کم ـ تەنگی ماژین ٥٤کم، بۆملەی نەقل ٢٤کم ـ لەرخە ٢٤کم ـ چۆكچرا ـ جگری ٢٤کم پردی کەرخە ٢٤کم ـ تاقی گەورە ٢٤کم ـ گولستان ٢٤کم ـ پردی تەنگ ٢٤کم ـ ملەی کەلەبا ٢٤کم، ملەیەکی سەختە ـ ملەی نەقل لە گۆمەشینەوە ١٨کم.

ملەی کەلەبا ـ گولستان ٥کم ـ پردی تەنگ ٢٤کم ـ خورەم ئاباد ـ قەڵای ئەسفەنجەری ٢٧کم ـ قالیی ٢٤کم ـ قەڵای ئاقەرین ٣٤کم ـ دەربەندی مەلادێ ٢١کم ـ سەربازگەی جایدر ١٨کم ـ لێرەوە بۆکەناری بەلووت ١٨کم ـ جۆزار ٢٢کم ـ پردی زاڵ ٢٢کم ـ قەڵای حوسەین ـ قەڵای بەڵا رووت ١٨کم ـ دیزفول ٢٠کم.

لوڕ لکێکی بەهێزو ناوداری کوردە، لەمێژووی عەرەب و ئێران و وتەی خاوەرناساندا، ئەم تیرەیە، بەر لە هاخامەنشی یەوە لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، لە چەرخی فەرمان رەوایی ساسانی یەوە، خاوەنی شارستانێتی و کەلتور بوون، شوێنەواری دێرینی زۆر بەڵگەی بوونیانە، شاری شووش لە شوێنی شوستەری ئیستا بووە، بەندەکەی پێش ئاوی کاروون بۆ دابەشکردنی ئاوەکەی، یەکێکە لەو یادگارانە.

چیای بەرزو بڵندو سەخت و ئەشکەوتی زۆری هەیە. پاش ئەتاپیکەکان، لە سەردەمی نادرشاو کەریمخانی زەندا ئاژاوەی تێدا پەیدابووە، نەخشەی ئیمپریالیزم و چاوتێبرینی نەوت و دەستەڵات گرتن بەسەر وزەدا، لە فەرمان رەوایی فوتح عەلی شای قاجار کاریگەری یەکی راستەوخۆی بووە، لەو ئاڵوزی یەدا.

١ - هەڕۆ - ٢ - سلسلة ٣ - دلفان ٤ - چیگنی ٥ - سەگەوەند
٦ - خورەمئاواو دیهاتیکورد ٧ - پاپی ٨ - تەرهان ٩ - بالاکریو
١٠ - لوڕیگەرمیان ١١ - گەرەکیومەنکر ١٢ - لەکستان.

بەشیهەڕۆ - بانێکی درێژو نارێکە لە نێوانی کێوەکاتی شانشینو کوردو زەردیلدو بلومانو ریملەدایە. پیران وەند، دالەوەند، کایدە رەحمەت لەم بەشەدا نیشتەجین.

باکوری - چەوتی کێوی کوچگە - گلەزەرد تا کوردگانەو کێوی وشتر مل - پیرماهی - ئاوسان.
خاوەری - کێوی شانشین کورد لە نالەشکێنەوە تا دەربەندی دینارئاواو کێوی باخ بیرەو تادەربەندی دەرەچی، کێوی گروتا حاجی ئاوا لەسیلاخوڕی جیا دەکاتەوە.
باشووری - زەردیلەوئەسکونە
خۆرئاوا - کێوی ریملەو بلومان.
بانی هەڕۆ لای باشووری خاوەرەوە بەرزەو روو بەخۆرئاوا نەوی دەبێت، ئەکرێت بە پێنج بەشەوە - رووبەری هەمووی ١٠٨٠کم٢.

١ - نیشتگەی کایدەرەحمەت لەباشووریەوە ٢ - ناوهەڕۆ - نیشتگەی خێلی دالەوەند ٣ - هەڕۆیخواروو - نیشتگەیخێلی پیرانوەند کەبریتییە لەمالئەسەد، چەقلەوەند، پیرداودە، کەمی لە سوپەوەند ٤ - دوورکێو - جێگەیشەعبان، شاویردی، پیرانوەند ٥ - یارئەحمەد، شوێنیمالقوباد.
چیاکانی - کێوەکانی بەشی هەڕۆ بریتیەبە لە کێوی بێکەسەو ملەی نالەشکێنەو کێوی شانشینیو باخەپیرو کێوی گەروی کۆچکە (ئەم زنجیرە چیایە تا مەلابەخت، هەمیشە رووی باکوورو نساری بەفری پێوەیە لەبەر ئەوە کانیاوی زۆرە) سەرەرای زنجیرەی ئاسماندۆلو چالە قوچ (کەبرتیتییە لەگەرۆی کۆچکەبەباشووری نەهاوەندا درێژبۆتەوەو ملەی بییەسووری نێوانی هەمەدانو کرمانشا لە تەنگی ئاوساردەوە ئەم چیایە ئەبیت بەدوو ریزەوە.
١ - بەرەو نەهاوەند ٢ - پیازکەکۆ، چالەقوچ، کوردگانە، وشترمل، پیرماهی، زنجیرەیوشترملکە بریتین لەئاوسانو چوارشاخو گلهۆ - نیوانی هەڕوو بەختیاری بە وشترانکیودا دەگەرێتەوە بۆ لای خۆرئاواد بەقارییو چەكقاری.

ریـزه چیـاکـانی هـەرۆ کـەمی‌دارستـانی هـەیـە وەکـود داری‌کـەوت، چەندئەوشکەوتێکی‌تیدایە نزیکەی هەشت ئەبێت یەکێکیان ٢٠ کەس ئەگرێت، ئـەشکەوتی وای هـەیە چێگـەی خێلێکی لێ ئەبێتـەوە پیێ ئەڵێن‌سنـەوبەرو تەنگەلەرە جێگەی ١٠٠ کەس لێ ئەبێتەوە، چیـای پوتـە لە زنجیرەی گـەرو لە بێ‌کەسەوە بەرەو باکووری خۆرئاوا کشاوە بەم ناوە جیاوازانەوە ـ ژێـر خالك ماڵکە، رازان، ئەشکەوتی موهەمەدخان، سوچ‌چك، ئاشیایی، پـونە، خـرسان، مورچە، گەکوتا، شیشە لەتەنگی‌بیهەلە ئەبرێتەوە، بەرامبـەری چیای گـەرون کشاوە،

بانێکی ناریك‌و گویستانەکانی کەوتونەتە ناوەندی ئەم دووزنجیرەیەوە، گەرووپونـەو بەشێکی دوورکیـو نیشتگەی خێلەکـانی شەعبـان‌و شاویـردی‌و سەبزعەلی‌و پیران‌وەنـدە، بەشی دووەمی بـەردە بەل‌و تـابیهەل‌و بـان دەشتی بەلکانی سەروو، ملەی تەخت، سەرواتەرم، شاجەمشیدی لە هەموویان روباری وشك پەیدادەبێت ئەمکێـوانە بـەردەلانی‌و کەمی داری کـەوتی پیوەیـە تێکرا گیای‌لەوەری زۆری هەیە بەتـایبەتی دەرەکێـو، چێگە بـەرزەکانی لەوورگـای هاوینەیە،

چێگە نەوی‌یەکانی بەرامبەر باشوورو خۆرئاوای لەوەرگای زستانەیە. بەرزایی‌یەکانی پونەو پشتی سەرئاوی سەوزەوە، مارمژ پیادە رێگەن لەناوەندی دولیسکان‌و خەمسانەوایەدا رێگەی زۆر باریك بەم کێوانەدا دەروات بۆکاروان‌و سوارە لەکاسیان‌قەلاوە بۆ دینارئاوا بەری نسێی کانیاوی زۆرە زەدی‌زارەکانی تیر ئاو دەکەن بەپیچەوانەی بەری بەرۆژی کشت‌وکـاڵی نیە. چیـاکانی ربملە، زنجیرەیەکە لە باشووری خاوەری بانی هەرۆبۆباکوری خۆرئاوای کشاوە بەگەلی ناوی جوداوە، وەکوو کونەزەردیلە، چاڵخایە،بلومـان، چاسـوقی، دارهەرمی، عەلەجانی، گوشتەکوژراو، رەشەبان، چالەقوچ، داپەران، ملەکاو، لە نیلە کۆتایی دێت. کێوی ریملە کانیاوی زۆرە، جەنگەلە، داری‌بەری وەکوو هەرمی، بـەروو زەردەداری هـەیە، بـایە مـەحمودو سیـاکەمـەر بەردولانین، خـاکی کـەمي ئەشکەوتی زۆرە، خێلەکان لەسیاکەمەرە سوودوورئەگرن بۆ بەخێوکردنی ئاژال کێوی وشترمل لە تەنگی ئاوسارد‌و کێوی گەرووە جیا دەبێتەوە بەرەو رووباری وشك‌و بەهەل‌و کرندوکۆو ئاوسان‌و کشت‌وەرزەو جولات‌و سلاوەرزی بە ناو خێلی مستەفاوەندو بەبورو ملەتەخت‌و سەرئاونەرم تاکاکەرەزا بە پێی جێگە گـەلی ناوی هەیە وەکوو ـ دەرەچولان، چوارشـاخ سلاوەرزی، بەکێوی دورەلەتوخن بەعەلەك هەلو دوورتەختان ناوی‌هاتووە. ئەم شاخانە بەردیفە،، هەموو لایەکی دارەزەردەو هـەرمی‌یـە دار بـەروو لەکـاکـەرەزاهـەیـە، گـل‌هـوچـەنگـەلە،

چواررێگەی سوارەو پیادەی هەیە، ٣ ئەشکەوتی تێدایە، گەورەکەیان ئاوتانە، چێگەی هەمووخێڵی پیرانەوەندی لێ ئەبێتەوە، ئەشکەوتی دەرەباخ سەدکەس ئەگرێت.

چەمەکانی بەشی هەرۆ ـ لەدامینی خاك‌ماڵکەو تەنگی کایدەرەحمەتـەوە بەرەو باکوورو رێگەی بروجرت ـ خورەم‌ئاوا ئەبرن لە نزیکی دووچیا لەخـاکی داڵەوەند بە نزیکی میرئەحمەدی، میراڵەوەند، کاسیان دائەروات و بەچەمی هەرۆ ناو ئەبرێت، دوای ئێرە بەچەقەڵەوەندو لە تەنگی بیدهەل و کاسیانەوە بە چەمی بایەوەلی لەوێـوە بەرەو کـرنکو، گڵەزەردەو خـاکی حەسـەن‌وەندا ئـەروات لە کاکەرەزا شارێگەی خورەم‌ئاواو کـرمانشـا ئەبـرێت لە بیهەلەوەبـە چۆلی دلم ناوئەبرێت و لەبوستان ئەچێتە خاکی سلسلە بەچەمی کاکەرەزا ئەناسـرێت بە قەلای گاژمێردا ئەرژێتە چۆمی کەشکانـەوە، چەمـەکانی تـر وەکوو بـزهەل و چەمی‌وشك و دینارئاواو کورگان بۆ کشتوکـاڵ سوودیـان هەیـە، هاوینـان کەم ئەکەن و نارژینە چەمی ترەوە.

دانیشتوانی ـ بریتی‌یە لەخێڵی کایدەرحمـەت، داڵەوەند، پیـرانەوەنـد، سەگەوەند، یار ئەحمەدی، زۆربەیان لەسیلاخورن، نیشتەجێن، ئەمیر ئەمنەعی بروجود لەم خێڵەیە.

میروەند دوو تیـرەن ـ دەشنیان و ئـالانتیان، دەشنیـان شەش لکن کـە ئەمانەن ـ پیرداودە، چەقەڵەوەنـد، رەش شلکە، دەلران، لوری. ئـاڵینان دوو تیرەی گەورەن، یـەکەمیـان ماڵ ئـەسەد کـە (٣)لکە ـ زەیـد ئهلی، بـارانی، کەرەم‌هراب. دووهەمیان مـاڵ قوربـان ئەوانیش (٣) لکن ـ بـار ئەحمـەدی، شەمـه ، سەبزئەلی.

یـار ئەحمـەدی و کایـدەرەحمەت ئـەڵێن لەشیـرازەوە هـاتـوون ئێستـا بـەکشت‌وکـاڵەوە خـەریکن، سـەگـەوەنـد لە قـەلا رەحیم، چـەرخستـانـە، مـەحفـەزبـادی، نیشتـەجـێن ئـاژاڵ بـەخێـودەکـەن، رەشمـاڵ‌نشینن، گەرمیان‌وکوێستان دەکەن، پیرانەوەند بە نیشتەجێی بەرکێو ئەناسرێن بەهۆی بـەچنگی خۆیـانـەوە زەوی‌وزاری دامێنی پـۆنـانیـان داگـیرکـردوە، لەخێـلی حەسەنەوەندن، لە تەنگانەدا فریای بەکتر دەکەون.

ئـابوری هـەرۆ ـ تێکـرا بـەکشت‌وکـاڵەوە خـەریکن لەگـەڵ ئـاژاڵ بـە خیوکردندا، بەرهەمیان گەنم‌وجۆونیسك و نـۆك‌وماش وکـزن و برنـج و سەوزو خەیارو ترۆزی و کاڵەك و شووتی و.... هتد. کانی خوێ و گەچ و گەراوی تێدایە.

یادگارو شوێنەواری مێژوویی ـ قەلای‌چوك لەکاولە قەلا، لە قەلا رەحیم و کاسیان چەند گۆرێ دۆزراوەتەوە، گۆزەوگلێنەو شتی بەنرخی تێدابووە، لەبابە

وەلی‌چەند تەپۆڵکەیەکی دەستکرد هەیە ڕەنگە یادگاری مێژوویی تێدابێ.
٢ ـ بەشی سیلسیە ـ
سنوری ـ باکووری ـ چیای‌گەڕۆ، سورکیو، خۆرهـەلاتی ـ کێوی‌ڕێمڵە، چوارشاخ، وشترمل. خۆر ئاوای ـ چەمی کەشکان‌وسپی‌کێو.
باشووری ـ کێوی سپی‌و ڕێملە.
ڕوبەری ـ ٣ هەزارکم[٢]
خاکی سِیلسیە بەپیت‌و سازگارو ئاووهەوا خۆشە لەهەموو بانەکانی‌تری لوڕستان بەفەڕترە.
چەمەکانی ـ کانی‌وئاوی زۆرە بەهۆی چیا بەرزە کانیەوە چۆمی لێ‌پەیدا بووەو بۆ بەشەکانی تر ئەکشێن، وەکو چەمی کاکەڕەزا (دلم) دوای ئاودێر کردنی ئەم‌بەشە ئەچێتە بەشی دلفانەوە.
دانیشتوانی بریتی‌یە لەخێڵی هەسەنەوەند، یوسف وەند، کولی‌وەند، لەم (٣) خێڵە (٦) تیرەی تر جیا ئەبێتەوە:ـ
١ ـ سودری لە هەرتانەوە هاتوون، ٢ ـ ڕەشنۆ لەخوڕەم ئـابادەوە هـاتوون، ٣ ـ سـاکنی لەئیستانـەوە ٤ ـ ئـاسنگـەر لەچیگینی‌یـەوە ٥ ـ سیـادوش لە دێزفوڵەوە ٦ ـ کورد لە پشت‌کۆوە هاتون.
مۆناتی ئەم بەشە (٣٠) هەزار کەسە.

ئەو جیگایانەی سەربە سیلسیەن، ئەمانەن ـ ڕەبات لە باکوری کاکە ڕەزاو بەستام لەخۆر هەلاتیەوە بەسەر ئاوتـاڵو باشـوری لە خوڕەم ئـاواو سپی‌کێو ئەبڕێتەوە.
ڕەبات چەند تەپۆڵکەیەکی تیدایە وەکو ئەیواندەرو بەستام گژوگیای زۆرە کەناری چەم‌و بەرزایەکانی داری بەڕوو مێوی سـروشتی تێدایـە دوو چەمی پچوکی پێدادەڕوات زەوی‌و زاری ئەو ناوە ئاو دەدەن یەکەمیان چەمی ڕەباتەو لەکانی ڕەباتەوە دێ بەرەو خوڕەم ئاوا ئەکشێ. دووهەم چەمی کەژەڵە کەم ئاوەو هاوین ووشك ئەبێت، بەروبـوومی ئەم بـەشە بـەرهەمی ئـاژاڵو کشت‌وکاڵە، گـوندەکـانی بریتی‌یـە لەمـانـە ـ شـەبـەیخـون سـادق ٣٩ خـانـەوادەیـە، ڕەباتی‌شەبانعەلی ٣٦ خانەوادەیە، سەرئاو تاڵ غلام ڕەزا ٣٦، سەرئاوی‌ڕۆح ٦، پیرحەیانی ١٤، قەلای میرزا سەی ڕەزا ١٢، چەم چەقەل ١١، دەوڵەت شاهی ٢٤، موریدخانی ٢٢، سەرئاوی ڕەبات ٦، دار حـەوز ٣١ زیرینی چڤـا حاجی حەسەن ١٤، زیرینی ئەولا ٣٧، تەنگ حەسەن ١٤، کەپك ئەحمەد ١٩ خانەوا دەیە.

بەشی کاکەڕەزا ـ کبر ٣٢، حەمەد ئەلی ١١ موهەمەد ١٠، ئەلی ٦، برایم بەگ ٥٠، حاجیئەلی ١١، هاشم ٩، ئەلیئاغا ٥. بەشام ـ وەکو رەبات سەر بە سیلسیلەیە تێکڕا ٢٦ گوندەو ٤٤٥ خانەوادەیە، بەکشتو کاڵەوە خەریکن هەروەها دوو ئاوئاڵشتەر ٢٨ گوندەو ٣٦١ خانەیە.

حەنامو بریسك ـ بەکشتو کاڵەوە خەریکن، داری بەرییان هەیە، ٣٤ گوندەو ٢١١ خانەیە.

بانی ئاڵشتەر ـ ئاڵەئەژدەر ـ بانێکی خوشو بەپیتو ئاو هەوای سازکارە بەکشتاو کاڵو ئاژاڵ داریەوە خەریکن.

کولیەوەند ـ ٢٦ گوندەو ٤٧٥ خانەوادەن بە کشتو کاڵ ئاژەڵ داریەوە خەریکن.

یوسفوەند ـ ٤٠ گوندەو ٥٨ خانەیە تەنگ خەبات ـ لە ناوەندی فەیرۆز ئاوا، کولیەوەندو گاولوژو لاغریدایە، ٦ گوندو ٧٥ خانەیە هەر وەکو دراو ـ سێیەکانی وایە.

گاوە کوژ ـ لەناوەندی خاوە، لاغری، تەنگ خەباتدایە شوێنەکەی کوێستانەو دێمەکارە، ژیانیان لەسەر ئاژەڵە، ٤ گوندو ٣٨ خانەوادەن.

قەلایی ـ ٧٥ خانەوادەن ئیستا نیشتەجێن، لە پێشدا رەشمشاڵ نشینبوون.

ئابوری ـ هەموو جۆرە کشتو کاڵێکی هاوینەو زستانە لەبەشی سیلسیەدا ئەکرێت، لەوانە توتنولۆکە، سەرباری جەنگەڵو لێرەوار ولەورگای چاکیشی بەتایبەتی لەکەمەر سیاو کەناری روباری ززوو، کەهەمان هەندێ جار بەرەو بەشی چیگینی ئەڕۆن بەدوای لەوەڕا. بازرگانیان لە سەر بروجردو خورەم ئاواو ئاڵئەژدەرە.

کانی گەچی هەیەلەرەباتو سەرئاوتاڵ وە ئەڵێن نەوتی تێدایە، خوی لەرەباتو سەرئاوتاڵ، قسڵ لەکاکە رەزا هەیە. یادگاری مێژوویی لەکەلاوەکانی شاری کۆنی ئاڵئەژدەر شوێنەواری دیارە.

لە هەندی بەردی کێلی گورستانەکەی نووسینی مێخیو کۆن ئەبینی، شوینەواری خانووی کۆنی تێدایە.

٣ ـ دلفان ـ

شوێنی، لە باکووری لورستانە.

سنووری ـ

باکووری ـ روباری کاسیات

خاوەری ـ کێوی گەرون، بەرزایی سەرکەنداو

باشووری ـ سورکیو، روباری کەشکان ـ تەنگی شەنە
خورئاوایی ـ کیوی سپی
ئەندازەی فراوانی زەوی یەکەی ١٥٠٠کم٢
روبارەکانی ـ کاسیاب، کەشکان، گەلی چەمی تر بەناویا ئەروات.
ریگەوبانی ـ لەهەموو دلفاندا، گوزەرگەو ریگەی پیادەو سوارە هەیە، تاکە ریگەیەکی ئوتومبیلی هەیە لەهەرسینەوە بۆ خورەمئاباد، بە نـاوەندی دلفـاندا ئەروات.
کێوەکانی ـ کێوی گەڕوو بەرزترین جێگـەی ٢٧٠٠م ئەپی لەرووی دەریـادە، گەلی ریرەو گوزەرگەی هەیە، وەکوو ـ
١ ـ کاماسیاب، سوارە ریی گەرکی، گەرکیبچووك، رازنەی بچووك، بۆسراوە، کاوارە بۆ پیادە، لە ناووندی ئەم ریگەیە، ئەشکەوتی هەیە ١٠٠ کەس ئەگرێت و تێیدا ئەحەوێتەوە، تاوە مۆلە بۆسوارەرێ، ترشکە بۆ پیادە، نوکەری، حەسەن توخچەو یادوولیسکانی پیادەرێ وناریکەی سوارەرێ.
سەرەرای ئەم ریرەوانە، ریگەی تری پیادەی زۆرە.
٢ ـ کیوی جێگە دزان ـ بەرزو بەردەلانییە، کەوتۆتە ناوچەی کـاکەوەنـدەوە، چەند قوللەیەکی بەردینی گرنگی هەیە.
٣ ـ سەرکەشتی ـ گەرمیانە، لەوەرگای هەیە، کێویکی گلیە، جەنگەلی پیوەیە.
٤ ـ کێوی بزگەن ـ زەویو زاری کشتوکالی هەیە، ئاووبـای خۆشـە، دەونگی پیوەیە.
٥ ـ کیوشاویلان ـ بەردەلانیو کەم درەختە.
٦ ـ سورکێو ـ گلیەو درەختیکەمە.
٧ ـ کێویمیهراب ـ بەردەلانییە، دوو ریرەوی هەیە، قەلایەکی گەورەی تێدایە، بۆبەرگری.
٨ ـ کێودال گیروتەکنی ـ بەرزی کەمە سنووری نێوانی دلفانو چیگنیبە.

## بەشەکانی دلفان ـ

دلفان ئەکرێت بە ٨ بەشەوە ـ
١ ـ خاوە ـ بانی خۆرهەلاتیەتی لەسەدەی ساسانیەکانـدا سەردار لەقـەلای کفراش فەرمانرەوابووە، شوینەواری ئیستاش دیارە، زەویوزاری بۆ کشتوکال باشە بازرگانی لە تەك نەهاوەندا ئەکەن، بەئاژالداری بەریوە دەچن بە زستان بۆ

لەوەر دەچن بۆ گەرمیان بەرامبەری قەلای کفراش کە ئیستا ئارامگەیە، بە ۳ کم لەولاوە ئەشکەوتی هەیە تا ٤٠ کەس بەئەسپەوە تێدا ئەحەوێتەوە، گەلی یادگاری مێژوویی تێدایە.

۲ - چاواری - خۆرهەلاتی کێوی گەروو خۆرئاوای نورئەلیو باشووری - کەرەم ئەلی، باکووری ئیترەوەندە. ئەم ناوچەیەدوو بەشە - گیلاسو سپی کشتوکالی ئەم بەشە بەهۆی جۆگەو کانیاوی ساردەوە ئەکرێ وەکوو جۆگەی مورادخان، قوچ ئەلی شەلالوەندی، کێلان، کانیمیان روبار، کانی مواردوەیس، کانیخاکی بەك ئەلی، قەیناس، دەسپیفەیروزەوەند، میرتەیموری روباری خەرقانو سەرچاوەکانی.

کانەکانی - تەنها گەچی هەیە لەفەلەکەدین، دارو خەلوز لەجەنگەلەکانی نورئەلی پەیدادەکەن.

بازرگانی - لەتەك نەهاوەند کە ۳۰ کم لە چاورایـوە دوورە، بازرگـانی ئەکەن، هەروەها لە تەك هەرسینو باختەراندا خەریدو فرۆخت ئەکـەن. کێوی چەشم گولانە چێگایەیەکی قایمو سەختە، زنجیرەی چیای گەروتە لە نەهاوەند کۆتایی دێت.

دیهاتەکانی گەلێکی چۆلن، ئاواترینیان میکەوەندە، لەناوەندی چاواریدا ئاژالداری ئەکەن -

هەموو چاواری ۱۳ گوندە.

۳ - فەلەکەدین، بەکشتوکالو ئاژالدارییەوە خەریکن، بازرگانی لەتەك نەهاوەندا ئەکەن، لەبانیجەمشید گەنمو دانەوێلە ئەکەن یادگاری مێژوویی تییدایـە ۲۱ گوندە ۳۲۰ خانەوادەن.

٤ - میربەگ - میریەگو نورئەلی دوو برابوون دوو تیرەیان لێکە وتۆتەوە لە نزیکی یەکەوە، نیشتەجین.

میربەگ دوو بەشە - شایەوەندو مومیەوند، لەمانەش گەلی تیرەی تـری لێکەوتۆتەوە وەکوو - شاهیوەند، مالمومە، ژالی - کوسە، ئەحمەدەوەند، باوالی، ئەمانە مومیەوەندن. بەحەسەن بەگی، زەنگی وەند، پیرانـەوەند دەیـوسفان، میرئاخور، خورەمئابادی، ناتاری، دەرویش بابای گەورە.

میربەگ دوو پارچەیە - بریتین لە لاغری، گـەرکین - سـەمونـوهەمـام، نـەرگس دۆل وچەمی زەکـریا، وسـەنگاودار، سـەرناو، دووئـاو کـە رم ئـەلی وچاواری - سەرئاوی کەمەر، سەرئاوی تیزاب سامیان.

## سنووری میربەگ -

باکوری - خاوە، خۆرهەلاتی - گاوکوژو ئالئەژدەر خۆرئاوای - تیتیوەندو نورئەلی، باشووری - قەلائی لەسێ لاوە بە هۆی تەنگە سەختەکانیەوە، ئەچێتە ناو خاکی دلفانەوە لە تەنگەخەباتو تەنگشەتەو تەنگ بەرەوە. ریگەی شوسە لە تەنگی فەیروزئاواوە ئەچێتە ناو بەشی میربەگەوەو تێدەپەریتو. سەهراب کێو ٢٤ کم لە میربەگەوە دوورە جێگایەکی قایمە، لەویوە بەرەو خاوە لە دەمپەرەوە بۆ پردی موراد ئەچێتە ناو کەرەم ئەلیەوە، دانیشتوانی هەزارو پەریشانن، ئاژالدارن، گەرمیانو کوێستان ئەکەن لەکشتوکال بێ بەشن، هەرهەمووی ٥٣ گوندو ١٩٤٦ خانەوادەن.

٥ - تورئەلی -

خۆرهەلاتی - دواخاکی جاواریو کەرەمئەلی

خۆرئاوای - کلکەی تەنگییاد ئاوەر لە ئەولاد فوباد کۆتایی دێت.

باکووری - کەرکیو، سەرەتای دوولیسکانو تیتیوەندە.

باشووری - کێوی نەرگس و لوتکەی ئەرجنە

ئەمبەشە ٣ پارچەیە -

١ - جێگەی خەلیفەکورد - روباری یادئاوەر

٢ - مەیانی تەنگیو بەهمەنی

٣ - بزخانی، هەسەنگاودار - سەری ئاوی کر.

٤ - لای خۆرئاوای تەنگی یادئاوەر

٥ - ناوەندی نوردلی، گەنچیفە، بزلالە، تەنگدەم ئاویزە، سەر خەبات.

٦ - جێگا موسا - ئاوی بابەئەحمەد، گردکانە، حەوچەشمە.

نورئەلی بە هۆیروباری بائاوەرەوە سەرچاوەکانی گەنجینەومردوایزە، چالسەیل، یزخانی، سەرئاویکر ئاو ئەخۆنەوە، هەر گوندە - سەرچاوەی ئاوی خۆی هەیە، تەنگی بائاورەو، ئاشی ئاوی لێ هەلبەستراوە، جێگای قایمی هەیە بە کێوی چالخەلانو کەرقوچە ناو ئەبرێت.

لەنورئەلی کانی وای نییە، تەنها بەرەو رووی کدوکئەچنە باشووری نورئەلی، کانی گەچی هەیە، تیزئاوی چنارە موهەمەد بەکو لە گەنچینە قسلی لێیە.

له جـه‌نگـه‌ڵی نـزیکی کـدوك له‌مله‌ی ئـه‌رجنـه‌، دارو خـه‌ڵوز ئـه‌هێنن، کشتوکاڵیان‌نیوه‌ی دیمه‌کارو نیوه‌ی به‌رئـاوه‌. ئاژاڵدارن، گـه‌رمیان‌و کـویستان ئه‌که‌ن به‌زستان ئه‌چی بۆ گه‌رمه‌سیری ته‌رهان‌و نورئـه‌لی، له‌وی‌له‌وه‌ رگایـان هه‌یه‌. رێگه‌ی کرمان‌و خورهم ئاباد به‌ ناوه‌ندی نورئه‌لیدا ئه‌روات ئه‌وگوندانه‌ی نزیکی ریگاکه‌ن ئه‌مانه‌ن.

مواردویزه‌، مادەم ئاویزه‌، جێگاموسا، سه‌رئاوی‌بابه‌ئه‌حمه‌د. به‌رهه‌می - گه‌نم وگه‌نمـه‌شامی، نـۆك، ماش، نیسـك، جۆ زۆر سـاڵ گرِه‌بـا کشتوکـاڵیان ئه‌سووتننی، ئه‌م به‌شه‌ ٢٦ گوندو ٨١٧ خانه‌واده‌یه‌.

# «هەندێ وردە تێبینی و سەرنج

# لەرازی کتێبی پووشکین و وەرگێڕانەکەی محمدی مەلا کەریم»

☐ محەمەد خدر مەولود ☐

**«دەبێ هەموو نەتەوەیەکی ڕووناکبیر شت وەربگرێ و بەخشندەش بێ، ئەمەشیان ڕاستییەکی گەوهەریی ئەو تۆیە بۆ پێشکەوتنی ئەدەب کە نابێ نووسەری پشت گوێی بخستایەبەچاوێکی کەم سەیری بکا»**[1]

**- دالمپێر -**

کاتێ شاکاری کەڵە نووسەرێك دەکرێتە کوردی، وێڕای دەوڵەمەند کردنی کتێبخانەی کوردی، دیدەی خوێنەرانیش بەچاو لە هەندەرانێ ناهێڵێتەوە.

لەم چەند ڕۆژانەدا کتێبەکەی س. م پیترۆڤ، کە لەمەڕ ژیان و بەرهەمی شاکاری پووشکینەوەیە، مامۆستا محمدی مەلا کەریم، لە عەرەبییەوە وەریگێڕاوەتە سەر زمانەکەمان و بۆ لەچاپدانیشی دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی قۆڵی یارمەتی لە چاپدانی بۆ هەڵمالیوە. گەرچی کاتی خۆی هەر هەمان کتێبی ناو براوم بەزمانی عەرەبییەوە خوێندبووە، کە دکتۆر جەمیل نصەیف تکریتی، لە زمانی ڕووسییەوە وەریگێڕا بوو، وەزارەتی ڕۆشنبیری وڕاگەیاندنیش لە دەزگای ڕەشیدو لە ژێر زنجیرەی کتێبی وەرگێردراو (٩٨)و لە ساڵی ١٩٨١دا بۆی بڵاوکردبۆوە.[2]

ئێمەی خوێنەوار بەقەد پەرۆشی تینوو بۆ ئاو، پەرۆشی خوێندنەوەی ئەو تەرزە کتێبانەین کە لە ژیان و شاکاری کەڵە نووسەرو شاعیرانی دەدوێ. ئاخر دەبێ چ لەوە خۆشتر هەبێ، تۆی خوێنەری کورد بە زمانی خۆت شاکارانی دیستۆفسکی و تۆلستۆی، پووشکین، بلزاك، ستندال، دانتی، شەکسپیر، رامبۆ، بۆرلێر، ویتمان، کافاف، مایکۆفسکی و سان جۆن پیرەس، نازم و نیرۆداو پۆل ئێلوارو.......... بخوێنییەوە !!

وەك هەر خوێنەرێك باوەشی پەرۆشیم بۆ خوێندنەوەی كتێبە وەرگێردراوەكەی، ماموستا محمد كردەوە، كە لەخوێندنەوەشی بوومەوە ئەم چەند وورده سەرنجانەم لە لا گەڵاڵە بوو. كە دەشیان خەمە بەرچاو تەنێ مەبەستم بەرئەمەكی مەسەلەكەیەو هیچی تر نا.

خوێنەر لە لاپەرە (٣٠٤ی) كتێبەكە هەست دەكا هەڵبژاردنی كتێبەكە بۆ وەرگێرانی دەزگای رۆشنبیری‌و بڵاوكردنەوەی كوردی بە ماموستا محمدی سپاردووە، نەك‌خۆی بیری بۆ ئەوكارە چووبێ‌و هەڵیبژاردبێ. ماموستا خۆشی دان بەو راستییە دەنێ [دەزگای لەچاپ دان‌و بڵاوكردنەوەی كولتووری كوردی، وەرگێرانی ئەم كتێبەی لە عەرەبی‌یەوە بۆ كوردی پێ سپاردم].[٣]

هەڵبەت وەرگێرانی شیعر لە زمانی دووەمەوە ئەو تام‌و چێژە شیعرییە ناداتە دەست وەك ئەوەی لە زمانەكەی خۆی وەرگێردرێ.

بۆیە لەگەڵ رێزیشمان بۆ دەزگای رۆشنبیری و ماموستا محمدیش - دەبوایا دەزگای ناوبراو كتێبەكەی لە زمانە رووسی‌یەكەیەوە بە رووسی زان‌و وەرگێرێكی شارەزای شیعری پووشكینی بسپاردبا. خۆگەر دەزگای رۆشنبیری نەی توانیووە دەقە رووسی‌یەكەی كتێبەكە پەیدا بكات‌و وەدەستی بێنێ، ئەوا ماموستا محمد تێكستە رووسی‌یەكەی پەیدا كردبوو.. ئەوەتانی ماموستا خۆی دەڵێ [تێكستە رووسی‌یەكەی كتێبەكەشم پەیدا كرد][٤] لەمەشدا دەبوایە یا ماموستا محمد تێكستە رووسی‌یەكەی بدا بوایە دەزگای رۆشنبیری تا ئەوان بەرووسی زان‌و وەرگێڕێكی شارەزای شیعری پووشكین بسپێرن، یان ماموستا خۆی بیدابوایە یەكێكی ئاوەها.

ماموستا محمدی مەلا كەریم لەگەڵ پەیدا كردنی تێكستە رووسی‌یەكە دەرەقەت وەرگێرانی شیعرەكانی نەهاتووە. بۆیە وەرگێرانەكانی بە عەبدوڵڵا پەشێوی شاعیرو بەراوردكرنەكەشی بە دكتۆر جەمشید حەیدەری سپاردووە. بابزانین ماموستا ئەمەی چۆن چۆنی كردووە [بۆ ئەمە سەفەری تەشرینی دووەم - كانوونی یەكەمی ١٩٨١ی مۆسكۆمم بە هەلزانی، بە دۆستی خۆشەویستم عەبدوڵڵا پەشێوی قوتابیی دوكتۆرای ئەدەبی ئەنیستیتووتی رۆژهەڵات ناسیی سەر بە ئەكادیمیای زانستی سۆڤیەتیم سپارد ئەوكارە لە ئەستۆ بگرێ چونكە رووسی‌یەكی باش ئەزانێ‌و شاعیرێكی باڵایشەو سەرەڕای ئەوە دۆستێكی بە سۆزی شیعری پووشكینیشەو زۆری لێ وەرگێراوەتە سەر كوردی. دواییش بەراورد كردنەوەی وەرگێرانەكەی پەشێوم لەگەڵ تێكستە رووسی‌یەكەی پووشكین، بەدۆستی خۆشەویستم دوكتۆر جەمشید حەیدەری سپارد كە ئەویش پسپۆری ئەدەبی رووسی‌یەو رووسی‌یەكی باشیش ئەزانێ‌و خوێندنی باڵای

لەبەشی لێنینگرادی هەمان ئەنیستیتووت تەواو کردوە کە پەشێو لە مۆسکۆ تیا ئەخوێنێ].[٥]

لەم چەند قسانەی مامۆستادا ئەمانەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە. وەرگێڕانی شیعرەکان شاعیر عەبدوڵڵا پەشێو لە ڕووسی یەوە وەریگێڕاوەو دکتۆر جەمشید حەیدەریش ئەرکی بەراورد کردنی وەرگێڕانە ڕووسی یەکە گرتۆ ئەستۆی خۆی.. بۆیە ئەمانە مافی ڕەوای خۆیان بوو گەر ناویان لە سەر بەرگی پێشەوەی کتێبەکە بنووسرا بوایە، نەك تەنێ بنووسرێ «محمدی مەلا کەریم لە عەرەبی یەوە وەریگێڕاوە». گەر لە سەر بەرگی پێشەوە ی کتێبەکە ناوی عەبدوڵڵا پەشێو دکتۆر جمشید بنووسرابا، ئەوا کتێبەکە جۆرە ڕەواجێکی تری دەبوو. کەوا دەڵێین، مەبەستمانە بڵێین: کاتێ خوێنەر کتێبەکە لە کتێبخانە دەبینێو سەرپێیانە سەیری دەکا، هەروا دەزانێ سەرتاپای کتێبەکە «محمدی مەلا کەریم لەعەرەبی یەوە وەریگێڕاوە» کەچی لەراستیشا وا نیە. مامۆستا محمد لە لاپەرە ١٨٩دا خوێنەر ڕوو بەڕووی ئەم راستیە دەکاتەوە.

ئەویش بەهۆی ڕەش نووس کردنی لاپەڕەکە بە پاشبەند. کە لە تێکستە عەرەبی یەکەی دکتۆر جەمیل نصەیفدا واش نووسراوە (القسم الثاني - نماذج من شیعر بو شکین)[٦] جا گەر مامۆستا محمد ئەوەی لە لاپەرە ١٨٩دا نووسیویەلە بەرگی بەرایی‌دا بینووسیبا کتێبکە بەشێوەیەکی ئەدەبی تر خۆی دەنواندو مافە ئەدەبیەکەی پەشێوو دکتۆر جمشیدیش دەدرا.

[خۆیشم بەوەرگێڕانو بەراورد کردنەکەی پەشێوو حەیدەریشدا چوومەوەو لەگەڵ وەرگێڕانەکەی دکتۆر جەمیل بەقەد یەکم گرتنو، لە هەندێ شوێندا لەبەر ڕووناکیی وەرگێڕانەکەی دکتۆر جەمیلو بۆچوونی خۆمدا وردە دەسکاری یەکم کردو، بەرهەمی ڕەنجی هەموان ئەمە بووکە ئێستا لەبەردەستی خوێندەوارانی ئازیز دایە.].[٧]

کاتێ خوێنەر ڕوو بەڕووی ئەم کارەی مامۆستا دەبێتەوە گەلێ پرسیاری ئاوەهای لەلا چەکەرە دەکا.. ئایا دەبێ مامۆستا محمد لە وەرگێڕانەکەی پەشێوو بەراوردکردنە کەی حەیدەری بە گومان بووبێ ؟!ئەی گەر وایە بۆ پێشتر کارەکەی بەوان دەسپارد ؟.. دەبێ هۆی چی‌بێ تامامۆستا وەرگێڕانو بەراورد کردنەکەی پەشێوو حەیدەری لەبەر ڕووناکی وەرگێڕانە عەرەبی یەکەی دکتۆر جەمیل دەسکاری بکا ؟.. کەی لە هونەری وەرگێڕانی شیعرا - کە ناسکترین هونەرە - شیاو گونجاوە وەرگێرانێك لە زمانە ئەسلییەکەی خۆی لەگەڵ تێکستی زمانی دووەم دەسکاری بکرێ ؟.

لێرەدا نامانەوێ باسی هونەری وەرگێڕانو ئەرکو پێوستی وەرگێر بخەینە

بەرچاو. چونکە نەکاری ئێمەیەو نەئێمەش بەقەد بەڕێزییان شارەزاو لێـزانین. بەڵام هەست دەکەین ئەو دەسکاری‌یەی کە مامۆستا محمد دەرهەق شیعرەکان کردویەتی تامو چێژی شیعری کەم کردۆتەوە. چونکە دەستکاری کردنەکەی لە ژێر ڕووشنایی وەرگێڕانە عەرەبی ـ یەکەو بۆ چوونی خۆی بووە. بۆ ئەوەی ئەم بۆچوونەمان لە حوکم دانی گوللە بە تاریك وە ناوە نێزێك نـەبێتەوە، ئـەوا دوو وەرگێڕانی شیعرە بە ناو بانگەکەی پووشکین کە (بۆچادایيف)ی ناوە دەخەینە بەردەست خوێنەرانو با ئەوان خۆیان سەرپشك‌بنو بزانن کامەیان تامو چێژی شیعری لەوی تریان زۆر ترە.

**خۆشەویستی، هیوا، شکۆی بێ جەنجاڵ**
**بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ هەڵیان نەفریواندین،**
**رابواردنی لاویمان، وەکوو خەون،**
**وەکو تەمی بەیانی بە سەرچوو**
**بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا**
**هێشتا ئاگری ئومێدمان تێدا ئەسووتێ.**
**هێشتا بە گیانێکی ئۆقرە لێ بڕاوەوە،**
**لە ژێر باری سەنگینی ستەمی لە چارە نووسراودا،**
**گوێ بۆ بانگی نیشتمان هەڵئەخەینو**
**کەنەفتی چاوەنواڕیی**
**تاوی ئازادیی پیرۆزین،**
**هەروەك چۆن دڵدارێکی لاو**
**چاوەروانیی تاوی ژوانێکی مسۆگەر ئەکا.**

* * *

**مادەم ئێمە بەئاگری ئازادی یەوە ئەسووتێین،**
**مادەم دڵان بۆ شەرەف لێ ئەدەن،**
**هاورێم، با ساتە شیرینەکانی گیان**
**پێشکەش نیشتمان بکەین.**

* * *

**هەڤاڵ ! باوەڕ بکە:**
**ئەستێرەی دڵگیری بەختیاری هەڵدێ**
**ڕووسیا لە خەو هەڵئەستێ،**
**ئەوسا لە سەر کەلاوەکانی کۆشکی زۆرداری**
**ناوی ئێمە تۆمار ئەکەن.**[٨]

ئەوەیان ئەو وەرگێڕانە بوو کە پەشێـو لە ڕووسی یەکـەی دا وەریگێڕاوەو دکتۆر جمشیدیش لەگەڵ تێکستە ڕووسی یەکەی بـەراوردی کردوەو پـاشانیش مامۆستا محمدی مەلا کەریم لە بەر ڕووناکی وەرگێڕانە عەرەبی یەکەی دکتۆر جەمیل و بۆچوونی خۆی دەسکاری کردووە.

ئەوەی خوارەوەشیان ئەو وەرگێڕانەیە کە عەبدوڵڵا پەشێو لە ڕووسی یەوە وەریگێڕاوە:-

**بۆ چادایف**

**گەرچی یەخ و هیوا و ئەوین**
**هێندە هەڵیان ئەفریواندین.**
**بێ پەروایی ڕۆژانی زوو،**
**گەرچی، وەك خەو،**
**وەك تەمی شەفەق بەسەر چوو.**
**بەلام**
**هێشتا ئاگری ئومێدمان تیا دەسووتێ.**
**هێشتا گیانمان بێ ئارامەو**
**لە ژێر باری سەخت و قورسی ستەمکاری**
**گوێ شل دەکەین**
**بۆ بانگەوازی نیشتمان.. بۆ هاواری.**
**وەك چۆن لاوێك،**
**لە هەرەتی هەرزەکاری**
**لەجێی ژوانا، چاوەڕوانی یاری خۆی بێ،**
**ئێمەش ئاوا،**
**چاوەڕوانین دەرکەوێ ڕۆژی ڕزگاری.**
**«هاورێم،**
**مادام ئێمە بۆ سەرفرازی دەسووتێین.**
**مادام دڵمان،**
**لە پێناوی شەرەفدا دەژی و لێدەدا**
**باخۆشترین ساتی ژیان**
**تەرخان بکەین بۆ نیشتمان !»**

* * *

**«هەڤاڵ،**
**بڕوابکە:**

**بەم زوانە، ئەستێرەی بەختیاری هەڵدێ.**
**رووسیا لە خەورا دەبێ.»**
**ناوی ئێمەش**
**لە کەلاوەکانی کۆشکی**
**ستەمکاری تۆمار دەکرێ.[9]**

پێش ئەوەی کۆتای بەم سوکە نووسینە بێنین وای بەچێتر دەزانین ئەم چەند قسانەی عەبدوڵلا پەشێو بخەینە رووکە دەربارەی شیعری -بۆچادایف- ی پووشکینە [ئەگەر یەکێك تۆزێکی لەبارەی رووسیای سەردەمی پووشکینەوە نەخوێندبێتەوە، ئەگەر یەکێك ئاگاداری ئەو سالانە نەبێ کە شاعیر لە قوتابخانەی -لیچێ- بەسەری بردوە، ئەگەر نەزانێ -چادایف- کێیەو دیکا بریستەکان کێن، زەحمەتە ئەوکەسە بتوانێ، وەستایانە شیعرە بەناوبانگەکەی -بۆچادایف- ی پۆشکین وەربگێرێ -].[10]

دواجاریش چۆن لەسەرەتادا گوتمان، ئێستاش دەیڵێینەوە مەبەستمان لە خستنەرووی وردە سەرنج وتێبینییەکان تەنێ بەرئەمەکی مەسەلە ئەدەبییەکەیەو هیوا خوازیشین مامۆستا محمدی مەلا کەریم ئەمانەمان بەسینگی فرەوان لێ وەربگرێو یاخوا قەڵەمەکەشی بۆ خزمەتی وشەو ئەدەبیاتی کوردی هەر لەکار بێ.

---

**پەراوێزەکان.**

---

١ - ئەدەبی بەراوردکاری، عەزیز گەردی، ل - ٣ - بەغدا چاپخانەی کۆڕ، ١٩٧٨.
٢ - پوشکین، ترجمە، الدکتور جمیل نصیف التکریتي تألیف، س. م بتروف. دار الرشید للنشر، بغداد ١٩٨١.
٣ - پووشکین، ژیان‌وبەرهەمی شاکاری. س. م پێترۆڤ. وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، محمدی مەلا کەریم. ل - ٣٤٠ - بەغدا، چاپخانەی (الحوادث) ١٩٨٣.
٤ - هەمان سەرچاوەو لاپەرەی پێشوو.
٥ - هەمان سەرچاوەی پێشوو. ل ٣٠٤ - ٣٠٥.
٦ - هەمان سەرچاوە و لاپەرە.
٧ - هەمان سەرچاوەو لاپەرە.
٨ - هەمان سەرچاوە لاپەرە - ٢٢٧ -
٩ - گۆڤاری بەیان، ژمارە - ٧٣ -ی مانگی ئاب و ئەیلولی ١٩٨٣. سێ هەڵبەستی پۆشکین - وەرگێرانی لە رووسییەوە عەبدوڵلا پەشێو، لاپەرە - ٤٩.
١٠ - رۆژنامەی هاوکاری، ژمارە - ٥٤١ -ی دووشەمە ٨/٩/١٩٨٠ لاپەرەی - ئەدەب و ژیان. پاشەکی بۆ شیعرێکی وەرگێردراو، عەبدوڵلا پەشێو.

# شانوناما
# شێخ ئەحمەدێ جزیری

نافع ئاکرەیی

دیاری:

١ ـ بو روحا بابێ من کو گەلەك جزیری دڤیا
٢ ـ بو وان کەسێت شەیدای هوزانا کوردی‌نە
٣ ـ بو جوتیاری د ڤێ گیرو گرفتا وی‌دا
٤ ـ بو دەیکا جوتیاری کو گەلەك زەحمەتێ ب مەڤە دبەت.

ئەکتەر

١ ـ جزیری
٢ ـ خانی
٣ ـ میر

٤ ـ وەزیرو یاوەرو دارو دەستێت میری
٥ ـ خویشکا میری
٦ ـ ژنکا میری
٧ ـ چەند کچێت میللەتی
٨ ـ زانای (١)
٩ ـ زانای (٢)
١٠ ـ زانای (٣)
١١ ـ زانای (٤)
١٢ ـ کۆنە میرێ (١)
١٣ ـ کۆنە میرێ (٢)
١٤ ـ ژمارە (١)
١٥ ـ ژمارە (٢)
١٦ ـ ژمارە (٣)
١٧ ـ گەنجێ (١)
١٨ ـ گەنجی (٢)
١٩ ـ شیرین
٢٠ ـ ئازاد
٢١ ـ سەبدایەکێ ب جلو بەرگێت نهو یێ ب سالادا چویی.
٢٢ ـ چەند. تولازو فەقیبو دەهواتێ.

«دەرهێنەر د شێت ڤان ئەکتەرا بکەتە
چەند کـەس کو ئـەکتەرەك زیدەتر ل
دەورەکی ببینیت».

## «تابلو ی یەك»

«شانویا تاری‌یەو ل پێش پەردێ چیروك بێژ مژولی جلو بەرکبێت خویـە رێکدبێجیت، روناهی دێ بو وی چیت، دێ ڤەجنقیت و ب شەپرزەیی دێ بێژیت».
چیروك بێژ: هێژایێت بەرکەتی... مێهڤانێت شانویامە د دیـروكو مێژویـا میللەتادا... هەر قویناغەکێ خەتیرەو ئەستێرێت گەشێت خو یێت هەین... ڤیجا

ئەگەر ئەم د دیروکا هەر میللەتکیدا بچینە خواریێ دێ گەلەك خەتیریت پڕ روناهیو ئەستێریت رەوشەندار هێتە پێش چاڤێت مە... د ناڤ وان خەتیرو ئەستێرادا... هندەك ژ وان د بلقنەڤە ل بەر وناهییێو هیندەك ژی دکزن هەر د ئیسێنەڤە... هندەك ئەستێر شارو بـاژەرەکی رەوشەن دەکەنو هندەك ژی وەلاتەکی.. یەلێ هندەکێت دی هەر کولانکەکێ روناك دکەنو هەر هند خەلك بەر پێت خو د ببنتەڤە... هەر وەکو مە گوتی د دیروکا میللەتادا گەلەك ئەستێرو ئەختەرو خەتیرە هەین... بەلێ ل هەمودەمادا هەر یەك روژو یەك هەیڤا هەبی... هەر یەك روژا هەی کوسوزو چاکییا خود دەتە سروشتی... دیسان هەرهەیڤەکا تیشك زێریتە تریسکێت خو ب سەر دونیاییێدا دئینتە خـارێو تاریـا شەڤێ لا ددەت... بەلێ وەسایە... دیروکا مللەتادا دویرنییە گەلەك ناڤدارو زاناوپالەوانو زیرەك هەبن وەك ئەستێرەو خەتیرو ئەختەرا بن... بەلێ دوورنییە گەلەك د زوّر بن... بەلێ د ناڤ واندا چەند داهێنەرو هونەرکار هەنە... هەر وەك دناڤ ئەستێرادا هەر روژەکو هەر هەیڤەك یاهەی ل هەمیا رەوشەندارترو پێش چاڤتر...

خوشتەڤینە... عەزیزێت من.. دیروکا تورو ئەدەبێ میللەتێ کورد ژی گەلەك خەتیرو ئەستێرتیت ناڤدارو زانا ییت هەین ل هەموو قویناغێت کاروانێ دیروکا ئەدەبێ مە بەلێ ل سەرەتا قویناغا چاڤ کرنەڤا ئەدەبو تورێ کوردی هەر تاڤو روژەك یا هەی کوخودانا داهێنانو هونەرکاری وزیرەکێیە ئەو ژی قویناغا لاڤەکێ زیرەکو جحیلەکێ جوانو زانایەکێ چالاکو شاعرەکی بێ وینەو دامەزرینەرێ تورو سەرکێشێ رێکا ئەدەبێ کوردیو شیعرا بلندو بەرزا ڤی میللەتەی... روژو هەیڤا دیروکێ بو و هەتا نهو (ی تریسکێت روناهییا وی هەر تارییێ ناهێلن و خوشییێ بەلاڤەدکەنە ناڤ دلا و رێکا نیشتیمانی پێشانی زاروکو گەنجێت میللەتێ مە ددەت... بەلێ ئەو هەیڤ.. ئەو روژ ئەو تاڤ... مەلا ئەحمەدێ جزیرییە.. هەرل ناڤێ ویدا دیارە خەلکێ جزیرا بوتایە.. ل وی جهی چاڤێت خوب روناهیا دنێ ییت کلداین... ب لڤلڤین جولانەڤا خو بییە سەرکێشێ هوزانو ئەدەبێ کوردی هەرچەندە ل پێش ویول پاش وی دویرنییە فرە خەلك هەبن بەلێ کەس نەگەیشتییە پایە یابەرزییا وی.. شانونامامە یا ئەڤ شەڤە؛ ل سەر ژیانو بیرو فیکرو هەلویستو هوزانو ڤیانو لڤلڤینێت مەلای جزیری نە..

گەلەك کێشەو دەمەتەقەو شەرەنیخ یا هەی ل سەر هونەرو بیرو باوەر فەلسەفەو هوزانا جزیری... بەلێ هەموو خەلك دزانن روژا بتنێ و هەیڤا بێوینەیا دیروکا ئەدەبی کوردی ل قوناغا دەستپێکرنا چاڤڤەکرنا ڤی تورە هەر ئەوەو کەسی دی نینە... هەرتیشکێت وی روژا جزیرینە کود ناڤ دلێ خانیدا د لڤلڤن و

ژ خودێ د خاست عەمرو تەمەنێت وی درێژ بکەت تا بشێت ژیانا جزیری نەمر بکەت هەر وەك ژیانا «مەم و زینێ» کریە بەهانە بو سوزو بیرو بروایێت د دلێ وی‌دا هەین...

«ل وی دەمی پەردا شانویێ دێ هێتە لادان و شانو ئودەیەکەو کۆنە میرەك یێ روینشتی د ناف بالیفاداو خامەیەکێ د دەستی‌دا مژولێ نفسینێ‌یە.. کوبالێ خو چەند جارا دێ ل ئەردێ دەت و چیروك بێژ دێ ئاگا ل خوبیت».

چیروك پێژ پێدا د چیت: ها تەقە تەقەك یا د هێت د ناف شانویێ‌دا... دیارە دێ دەست پێ‌کەت.. دا بزانین چی‌یە...» «کۆنە میرەکە بێ ب جل و بەرگێت بوتانی... یێ رونیشتی‌بەر هیندەك کتێب و خامەو کاغەز ل دەوروبەرێت وی د دانانیە... همە همەکی دێ کەت و چەند جارا کتیب و کانمەزا دێ هەلگریت و ڤەکەت و قەپات کەت و پاش گوپالی خو دو سێ جارا دێ ل ئەردێ دەت و دێ بێژیت:ـ

بیناڤە روها مەلێ جزیری
پێ حەی بکرا عەلی حەریری
کەیفك وە بدا فەیقهێ تەیران
حەتتا بأبەد بمایە حەیران

خوزیکەکا خودێ من عەمر مابا دا ئەز شیابامە من ئەڤ مێرچاکێ مەیدانا تورو ئەدەبێ کوردنی ب میللەتێ وی ناساندبا... بەلێ چ بکەمن هێزا تلی و دەستێت من ئەو هیندە نەمایە کو ئەز ل دەر مەقێ ڤی مەزن و هێژایەی دەرکەڤم هیڤیا دلێ خو ب گەهینمە ئەنجام و ب ئارامی ڤێ دنێ ب جێ بێلم...

«ل وی دەمی دو گەنج ـ کورەك و کچەك ب جل و بەرگێت کوردی‌ی مروڤەکێ پیر... ب سەرو رهێت سپی و درێژو جل و یە رگێت ئەمەندی و عەینەك ل چاڤادا دێ هێنە د ناف ژورا شانویێ‌دا و مژولێت گفت و گوو ئاخفتنانە.

گەنجەکە: سەیدا تو یێ دبێژی ژ بلی ئایین و سوفی‌گەریێ مەلای جزیری د هوزانێت خودا باسێ چو تشتێت دی نەکری‌یە... چەوا وەیە..؟!

سەیدا: بەلێ وەسایە.. هیچ بەلگەیەك د دەستێ مەدا نینە کو ئەم تشتەکێ دی ببێژین... مەلای جزیری د هوزانا خوەدا هیچ تشتەك مەبەست نەبی‌یە غەیری ئایین و سوفی‌گەری و ڤیانا خودێ نەبیت.

کچەکە: سەیدا... یا دیارە کو هونەرا جزیری د وێ هندی‌دا ئاشکرایە کو چەوا شیایە ب رێکا ژیانێ‌دا هەموو هیڤی و مەبەستێت خو د ڤەهاندنا هوزانێ‌دا بنیتە بەر چاڤ و هەمی زانستێت وی دەمی ب رێکەکا داهێنانێ‌دا ڤەهینیت و

بگەهینتە بەردەستێت خەلکی.. گەلەك دیارو ئاشکرایە ئەگەر ئەم وێ مێـژویا کۆمەلێ جزیری تێدا ژیای توژینینەڤە کا ئەو تا چێ ئاستەکی زیرەك‌و زانا و چالاك بویە...

سەیدا: ئەڤە لایەکێ گەلەکێ مەزنە دەبیا ئەم بۆ رونشین‌و بیرێ ژێ بکەین و بزانین ل وی دەمی چێ جورە زانست هەبینەو بزانین تا چێ سنورەك مەلای جزیری ئەو زانست زانینەو ئایا ل غەیری ئاینی تشت زانینە یان ژی نە.؟

**کورەکە**: سەیدا پا دویرتر ل وان هەموو تشتێت شرینێ گوتین ئەز لایەمی دیکە ژی ل زیرەکی و چالاکی‌یا جزیری دزانم ژ روڤەکرنا هوزانێت وی.

**سەیدا**: ئەو چێ لایە باب‌و ئازاد.. تو وەسا یێ ژ خو رازی..؟!

**کچەکە**: دێ بێژە «ئازاد»... ئەو تشتێ تە دوینێ بو من د گوت کـا دێ سەیدا وێ بیرێ وەرگریت یان ژی پەسند ناکەت.!

**سەیدا**: کا دێ بێژن باب‌و دێ ببێژن... دێ هوین هەردوو وێ شەکرێ یشکێنن... نێ هەوە دلێ من پەقاند..!

**کورەکە**: سەیدا لێرەدا ئەز دێ پـرسیارەکێ کـەم... ئەگـەر زەحمەت نەبیت.. بو پەرسڤا وێ پرسیارێ ئەزبەنی تو چێ د بێژی..؟

**سەیدا**: «ب تورەیی‌ڤە». کاتە پرسیار کریە.. دا پەرسڤا تە بدەمەڤە..؟ ب خودێ جحێلێت نهو گەلەك خوب بلند دزانن.. بەلێ وەکی دهولێ هیچ تێڤە نی‌یە..!

**ئازاد**: سەیدا تویرە نەبە.. مەبەستا من.. جزیری‌و ڤیانا میللەتی‌یە ل لایێ کورد پەروەرپی‌ڤە.. تو تشتەکی د هوزانا جزیری‌دا دبینی ؟!

**سەیدا**: هەی هەی.. ڤیجا هەر ئەڤە مابی... لایێ زانست‌و فەلسەفا مە گیفکێت برینێ.. هەر دورا لایێ کوردایەتیێ یا مایەڤە... هەمی لایەك هەبن هەر ئەو لا تێدا نی‌یە..!!

**ئازاد**: سەیدا پا ئەر هزر کەم ئەو لا یێ روون‌و ئاشکرایە د هوزانا جزیریێ نەمردا..!

**سەیدا**: دێ کربە نە وەك خەلك دێ بتە کەنە کەنی...!

**ئازاد**: سەیدا ما شول‌و ئاخفتن... گوتن‌و وەرگرتن‌و دەمەتەقە نی‌یە...؟

**سەیدا**: بەلێ.. بەلێ.. ئەڤە گەزو ئەڤە مەیدان..!

**ئازاد**: دێ وەرە سەیدا دا ئەم د ڤێ مەسەلێدا بچینە خارێ..!

**سەیدا**: دێ وێ شە کرێ بشکێنە... دا بزانین تە چ ڤێ‌یە..!

**شیرین**: دێ ئازاد بێژە... بیرا خو روهن‌کە.. دوینێ چەوا ـن‌و تە ئاخفتن د کرن ل سەر ڤێ مەسەلێ... دێ بو سەیدای ژی ببێژە..! «ل وی دەمی خانی هەر یێ ل جیهێ خو و گوهێ خو ددەتە ئاخفتنا وان»

**کورەکە:** سەیدا تو بخو دزانیو تەیێ گوتیە مە کو دویر نییە ل پێش جزیری مە هوزان هەبیت.. بەلێ وەك ژێدەروسەروچاوێت نڤیسینێ مە ژهوزانێت جزیری کو ب زمانێ رەهوانێ کوردی هاتییە نڤیسین چو ل بەردەست نینە..!

**سەیدا:** خو ڤێ هیندێ شاهد پێ نەڤێن.. کێ تو فێرە ڤێ چەندێ کری زەلام..!؟

**کورەکە:** دێ سەیدا... دا بیرەکێ ل وێ هیندێ بکەینەڤە... ل دەمەکی کو هەمی زاناو هوزانڤان و زیرەك و ناڤداریێت کوردا هوزان و توروئەدەب ب ئەزمانێت دیکە د نڤیسین یان ژی خود دا پال میللەتێت دیکە... خوە ل رەگەزورەەوکنێت و ئوجاغێت خوە دویر ڤەدکر.. ل وی دەمی مەلای جزیری شیعر یێ ب زمانێ شیرینيو دەهوانێ کوردی نڤیسین..! ئەرێ ئەڤە نابیتە بەلگەکا پرشەنگدار بو ڤیانا جزیری بو میللەتی خوە..؟!

**سەیدا:** دویر نییە ئەڤ ڤیانە ژی د دلێ وی‌دا هەبیت بەلێ ئەڤ بەلگە بتنێ بەس نییە..!

**شیرین:** یا سەیدا ئەز دێ تشتەکی دی بێژم... بەلێ ل دوینێ‌ڤە کو ئازادی ئەڤ ئاخفتنە د گەل من دا کرین.. ئەز ژی یا کەتیمە د ناڤ مێرگ چیمە نێت مەلای جزیری‌دا و من تشتەکێ سەیر دیتەڤە..!!

**سەیدا:** دێ باب و دێ.. ئەو چییە تە دیتیبەڤە شیرین..؟!

**شیرین:** سەیدا ئەگەر وێ مالکا شیعرا جزیری راڤەبکەینەڤە کو دبێژیت:

> **«گەر لولوئێ مەنثور ژ نەزمێ تو د خوازی**
> **وەر شیعرێ مەلێ ببین.. تە ب شیرازێ چ حاجەت».**

چاك ئاشکرایە کو جزیری چەند یێ ژخوەو ژهێزا میللەتێ خوە رازییە... چەند ڤیانا میللەتی د ناڤ دلێ وی‌دا تەڤنێ خو یێ راچاندی... ئەگەر هەر کەسەك ل سەر دەمێ مە ڤێ ئاخفتنێ ببێژیت دێ بێژن کەسێ ب چو نزانیت.. خوەل خەلکێ زیاتر دزانیت.. ئەڤە ژی بەلگەیە کە کو مەلای جزیری میللەتێ خوە ل هەمی کەسێت دیکە خوشتر یێ ڤیای..!

«ل وی دەمی «خانی» دێ خو لڤلڤینیت و دێ کوخیت.. هەر وەك سەیداو ئازادو شیرینێ ئاگا ل وی نەبییە..».

**سەیدا:** ئەڤە کییە ل ڤێرێ گوهێ خو د دەتەمە..؟!

**خانی:** کەکو وەرن.. هوین یێ ئاخفتنا ل سەر خوشتەڤییەکێ من دکەن.. دێ وەرن.. دا پێکڤە باخڤین.

(کوزیده هەر تێی ڕا دەمێنێو بزەیەکی نائومێدی دەکاتو دەڵێت: (مام خدر چاك دەزانم ئێوە باشترین ئادەمیزادن، دەتانەوێ هەر چۆن بێ کارەکە مەیسەر بێو لە مەراقی (نامە) رزگارم بکەنو خۆشی بکەوێتە دڵەوە، بۆیە ئێوەی خێر خواز ئەم (نامە) یەتان بۆ من رازاندۆتەوە..! مام خدر باش دەزانم ئەم (نامە)یە نامەی راستەکی نییەو راستی پۆشیشە.. سوپاستان ئەکەم هەستی جەنابتان بەرامبەر بە من هەستێکی مرۆڤایەتیە (دەنواڕێتە دەرەوەو دەڵێت) مام خدر، دوێنێ شەو خوا بە خێری بگێڕێ لە خەومدا لە سەر تاوێرە بەردێك دانیشتبووم تەختی زەویش وەکو فەرشێکی رەنگاو رەنگ دەینوواند، بە گوڵی هەمە چەشنە رازابووەوە رووباری بەر دەمیشم تووڵاو تووڵ بە پێچو پەنا بێ ووچان دەرۆیشتو هاژەی دەهات لە ناو جەرگەی سینایی ئاسمانەوە کۆترێکی سپی جوان.. هات، هەر هات لێم نزیك بوویەوە (نامە) یەکی بە دەنووك هەڵگرتبوو خستیە باوەشمەوە...

لە خۆشی دا ویستم هەڵی بپچڕم کۆترێکی تر هات دەنووکێکی لەنامەکەدا و لە دەستمی فراندو دایە شەققەی باڵو لە چاو وون بوو..! (تۆزێ بێدەنگی) مام خدر، لە خەویشدا بە ئاواتی (نامە) نەگەیشتم.. ئێستا ئە ئاوا زوو نامە بە دەستم دەگات...!؟

(دەستە سڕەکەی نا بە چاوەکانیەوەو دایە پرمەی گریانو... مام خدریش خۆی پێ رانەگیراو جۆرە گریانێکی کرد وەك ببۆڕێنێ ئەو جا چووە دەرەوە).

(قوتابیەکی تەمەن ١٢ ساڵ خۆی بەژوورەکە دا دەکاتو، چەند دەفتەرێکی پێیە، گوزیدە لێی وەر دەگرێو تەماشایەکی گوێچکەی قوتابیەکە دەکاتو ئەو لۆکەیەی کە تێی ئاخنرابوو دەری دەهێنێو، بە دەرمانی ناو چەکمەجەی مێزەکەی بەردەمی تیماری گوێی هەرەخەسی دەکاتەوە دەکات..!

(نامە) کە لە سەر مێزەکە هەڵدە گرێو لەتی لەت دەکاتو دەڵێت):

نامەی راستەکیم دەوێت، بە ڕاستی لەشارەوە بۆ من هاتبێ...!

(مام خدر) بە پرتاو خۆی بەژووردا ئەکاتو لە گوزیدە دەپارێتەوە دەڵێت:

- مام خدر: خوشکە گوزیدە دەستم داوێنت خێزانی (حەمە)ی برام هیلاکە، شیوەن کەوتوەتە ماڵەکەیان لە ڕێی خوا فریایان بکەوە.

(گوزیده رائەپەڕێو ئەڵێ).

● گوزیدە: باشە وا هاتم... واهاتم،، (مام خدر لە پێشدا بەپەلە دەچێتە دەرەوە دووا بە دووای ئەویش گوزیدە دەڕوات.

● ● ●

## پەردەی سێیەم

لەپشتی پەردەی شانۆوە دەنگە دەنگی قوتابیـان دێتو دەرس دەخوێنن، لە دووای ماوەیەك (گوزیدە) دێتە ژووری ئیـدارە لە سەر مێـزەکە دادەنیشێو هەندێ دەفتەری پێیە لەسەر مێزەکەی دادەنێ.. (مام خـدر دێتە ژوورەوە..!)

● مام خدر: مامۆستا گوزیدە.. مامۆستا گوزیدە دەڵێن دووکـەس، یەکێکیـان ئەفەنی‌یە، بە ڕێگاوەن بەرەو ئاوایی دێن...!

● گوزیدە: وەکو بشلەژێ.. ئەفەنی.. تۆبڵێی ئەو.. ها... تۆبڵێی (نامە)یان بۆ من پێ بێ..!

● مام خدر:ـ مامۆستا گوزیدە وا بەرەو پیریان ئەچم، با بزانم چە کارەن.! (مام خدر) دەچێتە دەرەوە، گوزیدەش خەریکی خۆ ڕێکخستن بوو..!

مام خدر خۆی بە ژووردا ئەکاتەوە.

● گوزیدە: ها.. مام خدر خەبەری خۆش..!

● مام خدر: (هەناسەی سوار بووە) وا بەرەو قوتابخانە هاتن.

ئەفەنیەکە درێژێکی باریکی سەر... نازانم (مام خدر قسەتەواو ناکات هەر دووکیان خۆیان بە ژوورەکەدا ئەکەن، یەکێك ئەفەنی ئەوی تـر جلو بـەرگی کوردی لە بەردایە، ئەفەنی خۆی بە گوزیـدە ئەنـاسێنێ: (موحسـین ئەفـەنی شکێنەری پەروەردە) ئەم برایە (شەریفی) هاوڕێمە .. چاوێك بـە ژوورەکەدا

دەخشێنێو پشت لە گوزیدە دەکات (شەریف) جانتاکەی دەستی لە قوژبنێکی ژوورەکە دا دەنێ).

● موحسین: (لەشەریف دەپرسێ) شەریف، باش بوو بیرم کەوتەوە، ئەو کابرایەی کە بڕیاری دابو (نامە) کەمان بۆ بهێنێ ئایا هێنای یا نەی هێنا...؟ دەبێ نەمان خستبێتە ناو چانتاکەوە...! تۆ بڵێی لە بیرمان چووبێ..! (گوزیدە کە گوێی لەم وتەیە دەبێت شپرزە دەبێت لە موحسین ئەفەنی دێتە پێشەوەو:

● گوزیدە: نامە...! نامەی...

● شەریف: (قسە بە گوزیدە دەبڕێتو)

نامەکە ڕۆژی شەممە بوو، بڕیار وابوو کە بیهێنێ.. (ئەمان لەم قسانە دابوون مام خدر) بە پسکە پسك بەرەو جانتاکە ئەچما، وای دەزانی نامەکەی تێدایە..!

● گوزیدە: چۆن... لە ڕۆژی...

● موحسین: (گوێ لە گوزیدە ناگرێت ڕووی دەمی هەر لای شەریفە) دەستەکانی هەڵدە گلۆفێ وابزانم نامەکەی بۆ دائیرە هێنا تۆ بڵێی هەر لە ناو چەکمەجەکەدا جێم نەهێشتبێ..؟!

● مام خدر: (لێیان دەچێتە پێشەوەو دەڵێ) جەناب، دەتوانم هەر ئێستە بچم ئەو (نامە) یەت بۆ بهێنمو زۆرم پێ ناچێت..!

● موحسین: (بە تیز پێ کردنێکەوە) هەر ئێستە بچیت ـ!؟ بۆ.. تەیارەی نەففاسەی..!

● مام خدر: بەڵێ: ئەمر بفەرموون هەر ئێستە ئەچم..!

● شەریف: (دەستێك بەمام خدرەوە ئەنێتو) دە ژاوە ژاو خۆ وەکو تانجیش تێی تەقێنی هەتاکو ڕۆژ زەردان ناگەیتە شار، ناتەوێ ئەمشەو لەم گوندە ناخۆشە بمان هێڵێتەوە.

● گوزیدە: (هەر وەکو بلاڵێتەوە) ئێوە جەنابتان هیلاکن، پشووی خۆتان بدەن... من مام خدر باش دەناسم، وە ئاواییش دەزانن، ئەم پیاوە لە ڕێگاوباندا تیژ ڕەوە، باوەڕم پێیەتی کە دەتوانێ نەگاتە چێشت تەنگاو نامەکە بهێنی..!

● موحسین: (لووت هەڵدەکات) بە نیسبەت ئێمەوە ئەو نامەیە ئەوەندە گرنگ نییە، هەر گوم نەبووبێ پێویستی بەم پەلە لێ کردنە نییە، وەکەسیشدا با بە شوێنیدا هیلاك نەبێت.

● گوزیدە (دەستەو داوێنی موحسین ئەفەنی دەبێت) تکا ئەکەم مامۆستا ئەو (نامە)یە باوون نەبێت..!

● موحسین: (سەری لەم رەفتارەی گوزیدە دەرناچێ، دەپەشـوکێ) بەخـوا سەیرە، بۆ تۆ ئەو نامەیە بەچی تێدەگەی..؟!

● مام خدر: (لەقسەکەی موحسین هەڵدە داتێ) ئەرێ وەڵا جەنابی موحسین ئەفەنی گوزیدە خان زۆر مەراقی ئەو نامەیە دەخوات، وەختە سویی ببێتەوە.

● شەریف: کورە تۆ چی دەڵێی، ئەوەی ئەو نامەیەی نووسیوە فەری بە سەر ئێوەوە هەر نییە نە دەیناسن، نە ئەویش ئێوە دەناسێ، نە ئێوەش دەزانن چی لەو نامەیەدا نووسراوە، جا لە پای چی بۆ ئەو نامەیە ئەوەندە شپرزە بوون..؟

● موحسین: (لە گوزیدە دەچێتە پێشەوە، دەپرسێ) بەچیدا دەزانی نامەم بۆ هاتووە، چۆن دەزانی چی تێدا نووسراوە..؟

● گوزیدە: (وەکو ببزرکێنێ وا قسە دەکات) ما... ماوەیـەکی.. در... درێژە.. تە.... تەمادا... ری ئەو... نا.... نامە... یەم..

● موحسین: (رقی هەڵدەستێو ناو چەوان گرژ دەکاتو لە کاتی قسەکردندا کەف دەچەرێنێ) نەء.. نەء خەڵەتابی وا بـزانیت ئەو (نـامە)یـە بە تـۆز قاڵ پەیوەندی بە تۆوە نییە، بەڵکو پەیوەندیی بە مامۆستایەکی ترەوە هەیە ئەویش ئافرەت نییە..!

● گوزیدە:ـ (ور دەبێو دەتاسێو زۆر بە مەلوولیەوە) ئەو نامەیە خۆشی بێو ترشی بێ، دەبێ پەیوەندی بەمنەوە هەبێت (لەم کاتەدا قرە قرِی قوتابیان لە پشت پەردەوە پەیدا دەبێت، گوزیدە روو دەکاتە مام خدر) برۆ ئەو قوتابیانە بێ دەنگ بکە هەتاکو خۆم دێم..!

● شەریف:ـ (بە دەنگی بەرز پێدە کەنێ).

● موحسین:ـ (لە سەر هەمان توورەیی بەردەوامە) تۆ ئەڵێی ئـەو (نامـە)یە پەیوەندی بەمنەوە هەیە، ئەگەر پەیوەندی بە تۆوە ببوایە شندرو پندرم ئەکرد..!

● گوزیدە:ـ بۆ چی مامۆستا، خۆ ئەرکی هەڵگرتنی ئەو نامەیە ئەوەندە قورس نەبوو،

● موحسین: نەء.. بەلام ئەگەر ئەو نامەیە بۆ تۆ بووایە ئەنجامەکەی زۆر قورس دەبوو.. بڵێ بۆ..؟ ئا ئەمە حاڵی قوتابخانەکەت نییـە، فەوزا بێ سـەروپێ، بێ تەرتیب.. (لە حرسا موحسـین بە دەوری خـۆیدا خـولی دەخوارد) سـەرەرای ئەمانەش دەتەوێ نامەکە پەیوەندی بە تۆوە هەبێ.

● گوزیدە: (بەهێمنی) مامۆستا هێشتا سەرێی قوتابیەکانت نەکردووە، لە حاڵ ئەحواڵیو هەڵسو کەوتی منت لەم خەڵکی دێیە نەپرسیوە، چاکم خراپم، ویژدان چۆن هەڵیدەگرێ وا بە پەلە فرمانی نارەوا بدرێت...!

● موحسین:ـ (تورە دەبێتەوە) ئـەی ئەوە نییـە قرە قـرِی مندال، پیسی نـاو

قوتابخانە، دەفتەری چەواشەی سەر مێزەکەت دەشتەوێ (نامە)کە پەیوەندیی بە تۆوە هەبێ.

● گوزیدە:ـ (نامە)کە هیچ پەیوەندی‌یەکی بە چاکو خراپی قوتابخانەکەوە نییە، ئەو (نامەیە) تایبەتیە بە خۆم..!

● موحسین:ـ (دەست بەیەکدا ئەداو) ئا ئەمەیە سەیرو سەمەرە (بانگی شەریف دەکات).

● شەریف:ـ بەڵێ موحسین ئەفەنی..!

● موحسین: ئەو دەفتەرەم بۆ دەربهێنە.

(شەریف دەچێتە لای چانتاکەو دەفتەرەکەی بۆ دەهێنێ، موحسین‌یش لە سەر کورسی‌و مێزەکە دادەنیشێ، دەست بەنووسین دەکات، لە دوای نەختێك روو دەکاتە گوزیدە..!) یەکەم دەبێ دەوامت مەزبووت بێ، ژووری ئیدارە با ڕێك‌و پێك بێت، هەوڵ بدە با مستەوای زانیاری قوتابیان بەرز تر بێت..!

● گوزیدە: (دەچێتە بەردەمی) ئاموژگاریەکانت لە سوودی قوتابیان‌و قوتابخانەیە، بەسەرچاو باشتر بەجێیان دەهێنم... بەڵام منیش لێت دەپرسم کوا (نامە)کەم..؟ (شەریف بزە دەیگرێ‌و سەر با دەدات).

● موحسین: خوشکێ.. (نامە)کە هی کار بەدەستێکە ناوی مامۆستایەکی نووسیوە تیایدا دەڵێت:

(زۆر نەخۆشە، تەندروستی خراپە پێویستیی بە چاودێری پزیشکی هەیە، هەفتەی دوو جار یارمەتی بدەن بەڵکو بی‌گوازنەوە ناو شار.. هەر ئەمەیە...!

● گوزیدە: (ماتەمی دای دەگرێ، شل دەبێ کزۆڵە دەوەستێ، چاو دائەخات، (موحسین‌و شەریف) ماڵ ئاوایی دەکەن‌و دەچنە دەرەوە، گوزیدەش وردە وردە بەشەکەتی دێتە پێشەوەو ڕوو دەکاتە بینەران‌و دەڵێت.

ئەی هاوار، کورە، خەڵکینە ئەی مرۆڤ، ئادەمیزاد، ئەی عالەم، خزمەت کردنی ئادەمیزاد هەر لەمن دەوەشێتەوە، تەنها خزمەتێ یەك خزمەت کە لە ئێوەی بەرێز داوا ئەکەم، لەو جۆرە (نامە)یەی کەپڕ بە دڵ، بەهەموو حەزوو ئارەزوومەندیمەوە دەمەوێ، وە بۆ من، تەنها بۆ من بنووسرێت...! دە.. ئەی خەڵکینە پاداشتی خزمەت‌و چاکەو مروڤایەتیەکەی من سەرجەم گشتی ی... دە بەبەرمەوە نەماوە فریام‌کەون‌و ئەو (نامە) پیرۆزەم بۆ بهێنن، تە سکێنی هەست‌و نەست‌و دڵی پێ بدەمەوە، بۆمني بهێنن، بۆمنی بهێنن، بۆمن بۆمن‌و بەس (دووا بە دوواش دەکشێتەوە هەر دەیڵێتەوە) بۆ من.. بۆ من.. بۆ... مـــ... ن.

---

**پەردە دائەدرێتەوە**

---

**دەبێ ئێستاش گوندە خنجیلانەکەی باکووری گەرمیان،**
**گزنگی خۆری بەیان و زەردەپەڕ ئاسمانەکەی لێڵ کات..؟**
**یان ئەوەتا بە تەمی هەناسەی لێقەوماوان**
**ژەهراوی بووە و پەلەوەرەکانیش بەرەو گەرمەسێر**
**باروبنەیان گواستۆتەوە و ئێستاکە تینوێتی ڕێگای هات و نەهاتیان**
**بەئاوی دەریا شۆرەکان دەشکێ...؟**
**یان ئەوەتا کەوتوونەتە گێژاوەی ڕقی زریانە تووڕەکانەوە..؟..**

---

# ژوور
# ژمارە سفر...

## غفور صالح عبدالله

---

باوە «یادگار» یشم هەموو ئێوارەیێک لەسەرڕێی بێریەکاندا دەوەستێ و چاو بۆ «نازە» دەگێڕێ و فرۆی مزگێنی لە هیزەکەدا بۆ هەڵگرتووم ؟]].. ڕێچکەی خووناوکەی ئارەقە لە تەوێڵتدا شۆڕدەبووە، بە گۆنا هەڵقرچاوەکانتەوە دادەچۆڕا، هەروەکو ئاوێکی روونی بەرکانی، بەسەر تاشەبەردی کلۆرەوە داکشێ، بازڵقەیان دەکرد، شوێنی برینە دێرینەکانی رووخسارتیان دەکردە گۆمی وورد وورد.

دەرەوەی ژوورەکەت ببووە جۆگەلەی هاژەی باییکی ساردوسڕ، کاتژمێرەکانیش لەو رۆژانەدا بە پێچەوانەی شەو رۆژەوە دەزرینگانەوە.. زەنگی کڵێسەو بانگی مزگەوتە پیرەکان دەنگەو ژاوەژاوی خەڵکە دەسەپاچەکەیان بەزۆرەملێ دەمژی و سەرلەنوێ ئێقیان دەکردەوە سەرجادە و کۆڵانە لەوتاوەکان.

سینه‌ماو مه‌یخانه‌و تیاترۆخانه‌کان، بـه بێ‌په‌روایـه‌وه سیخناخ‌ده‌بـوون، مێرد شاباشی داوێن پیسیی ژنه‌که‌ی ده‌کرده پێکی سه‌رمێزی قومار، هه‌ندێ جاریش رۆژ به ئاره‌زووی سێکسیـانه‌ی خـۆی گۆی زه‌وی ده‌خـوولانده‌وه.. تـه‌مه‌نی جه‌وامێریی زۆربـه‌ی شاره تێووروژاو و بـۆگه‌نـه‌کان بـه گوێـره‌ی تـه‌مـه‌نی چۆله‌که‌یێکی لاسار بوو..

مسته‌کۆڵه‌یێکت کێشا به‌سه‌رته‌وه، ویستت هه‌روه‌کو ده‌فرێکی پڕ خـه‌م‌و ژان ووردوخاشی‌که‌یت، که‌چی ئه‌وه‌نده‌ی‌تر خه‌مه‌کان ده‌ووروژان، جه‌سته‌تیان ده‌ته‌نی، ده‌نگی زوولاڵی ناوه‌وه‌ت وه‌کو مه‌لی ئه‌فسانه ده‌یقژاند و به‌رووی هه‌موو سه‌راپای مێژووی مرۆڤـایه‌تیـدا ده‌ته‌قیـه‌وه، ده‌ترسـای دیواره‌کـانی ژووره ژه‌نگگرتووه‌که‌ت بێده‌نگیی و خامۆشیی هه‌میشه‌یی پـاساوڵه ره‌ق‌و ووشکـه‌که داچـه‌ڵه‌کێنێ، بێده‌نـگ ده‌بووی، ده‌بـوویته جـاڵجاڵوکـه‌یێکی نه‌خـۆش‌و لات به‌سووچی دیواره‌کانه‌وه هه‌ڵده‌گڕای، بێ‌ووزه‌یی تووڕی ده‌دایته سه‌ر زه‌ویـه ساردوسره سێ مه‌تره چوارگۆشه‌یه‌که‌وه.. ژووره‌که‌ت له‌مێژدایه له سه‌ره‌ڕێ و چـه‌قی ڕێگاکـاندا بـۆویان دروست‌کـردووی، بۆ ئـه‌وه‌ی بـه بـاشیی وورده‌ت پێ‌به‌رده‌ن، یاخود هیچ نه‌بێ به‌زه‌ییت به خۆتدا بێته‌وه و ده‌ست به‌گریان بکه‌ی، تاوه‌کو له کلاوڕۆژنه‌که‌وه لێزمه‌ی فرمێسکت به‌دی‌بکه‌ن و هه‌ست به‌ئازایه‌تی و که‌ڵه‌میردیی خۆیان بکه‌ن..

ئێواره‌یه‌کیان تۆ تازه له سه‌رخه‌رمان ده‌هاتیه‌وه، هه‌موو ماندووییه‌کت به تیله‌ی گـه‌شی چاوه مـه‌ڕییه‌کـانی «نازه» ده‌ڕویـه‌وه‌و ئاواتـه‌کـانت تـاده‌هـات قورس‌ده‌بوون، له سه‌ره‌ڕێ مه‌ڕدۆشیندا تووشت بوو پێتی‌ووت:ـ

«ـ **رێبوار** ـ «کوێخا عه‌ودل» ماوه‌یه‌که نیازی خراپه، ده‌یه‌وێ تۆ ئه‌تك بکات ومنیش بکاته دۆستی خۆی، بالێره بڕۆیین و له قه‌زاو به‌لای ئه‌م خه‌ڵکه ترسنۆکه دوورکه‌وینه‌وه.. ئه‌گینا چیتر من ده‌پارێزی‌و تۆیش به‌خته‌وه‌ر ده‌کا، تۆ ته‌نیا باڵی و به‌رامبه‌ر به شۆرباخۆره‌کانی هیچت پێ‌ناکرێ...!».

پێت ووت:ـ

«ـ **نازه گیان**، ئه‌گه‌ر ئێمه بڕۆیین ئیتر کێ‌ی‌تر خۆشه‌ویستی ده‌به‌خشێته ئه‌م گونده‌و ده‌بێته چه‌قڵی چاوی «کوێخا عه‌ودل» و شۆرباخۆره‌کانی.. نا.. هه‌رگیز.. دووجار غه‌ریب نابم...».

کاتێك سه‌رت‌هه‌ڵبڕی، په‌نجه‌ره‌که ده‌می دابچڕاندبـوو، وه‌کو کـه‌پووی ئێفنه‌کێکی مردوو دانه‌کانی ریچه‌وه کردبوو، که‌وتیته گومان له‌ویش که نهێنی و رازه‌کـانت بدزێ و بیگـه‌یه‌نێتـه ده‌ستی مێـرده‌زمـه‌کـانی رۆژ.. تـه‌نـانـه‌ت په‌نجه‌ره‌کانیش له کرده‌وه‌ی خۆیاندا جیاوازن، هه‌ندێکیان ده‌بنه پـه‌یامبـه‌ری

دلدارەکان و کڕنۆش دەبەن بۆ چپەی کیژە ئەویندارەکان، هەندیکیان ڕێگا بۆ دزو جەردەکان پاكدەکەنەوە، ئەوەتا ئەم پەنجەرەییەش بە پێی فەرمان تاریکیو رووناکیت پێ دەبەخشێ... بەلام هەر نەئێستا پەنجەرەیێکی ئاوها، لەم ژوورانەڕا دلفرێنترە لە ئامێزی ئافرەتێکی شلوملو چاو بەئاشقال...

هەستایتەوە، گوێی چەپت نووساندە دیوارەکەوە، هەستتکرد پەردەی گوێت دەبووە ـ دەهۆلی زەماوندو شایلۆغانی قەرەجەکانی گەرمیان ـ، دلو، دەروونت ئەوهەن بووە، یەکەمجار بوو هەستت بە مرۆڤایەتی خۆت کرد.. چونکەتا ئەو دەمەی بۆ ئەم ژوورە نەهاتبووی، هەر لە منالیەوە رەهانەی کێوو تەلان بەندن کرابووی، مەگەر شەواوشەو خۆت بکردبایە بێدەنگی گوندەوە، لە بەر ماندوویی زوو خەو دەیبردیتەوە، ئیتر ماوەی ئەوەت نەبوو هیچ وەختێك بچیتە ناوخەلکی و وەکو پیاوە خاوەن ژنو مندالەکان، باسی پێویستیەکانی رۆژانە و دوارۆژت بکەیت. تەنیا «نازە»ت هەبوو، ئەویش تاکە تەزوویەکی خۆشەویستی بوو پێگەیشتنی کەوتبووە دەستی رۆژگارەوە.. زۆرجاریش ئەوەندە مەویس و پرزە لێبڕاو دەبووی، دەتوویست گوند بەجێبێلی و بچیت لە شاردا کرێکاری بکەی، بەلام هەرکە نازە پێی دەووتی:ـ

«رێبوار.. تا گیان وەکو سەگێکی هار، بە کەلبە لەشم بکرۆژێ، دەبمە سێبەری بێئۆقرەییت، مەگەر مردن تاسەی چاوەڕوانیم بتاسێنێ، یان تیخی خوێناوی زۆردارەکان بکەنە قردێلەی قژەکەم، ئەگینا کەسێکی تر نابێتە هاوسەرو هاودەمم». ئیتر تۆیش ئەوەندەیتر پێت لەزەووی گوندەکە دەچەقاند و خۆت بەشۆڕەسوار دەزانی..

خوێنەکەت بە غەلبە غەلبەکەی دەرەوە کەوتە قولپدان، سۆزێکی گەرم دەبوە فرمێسکی قەتیسماوی دیدەکانت، پاژنەی پێلاوەکان، دەنگی مارشێکی ناسازیان بە قیرتاوی جادەی قەبرغەی ژوورەکەت دروست دەکرد، بەخەیال لەگەل دەنگی پێلاوی ئافرەتەکاندا خۆت بەتەنیشت ئافرهتێکەوە چەسپدەکرد، دەستێکی سۆزاویت بەقژەکەیدا دەهێنا، ئەنجا بە شەرمێکەوە ماچێکت دەکرد، بەلام هەرکە بە خۆتدا دەهاتیتەوە، لێوەکانت بەدیوارە ساردو سڕەکەوە نووساون، **«دەنگێکی زۆر نەرمە.. ئا.. ئا.. دەنگی پاژنەی پێلاوی ئافرەتە..! گوێم راهاتووە، دەنگی پێی ئافرەتەکان بەچاکی دەناسم.. دەبێ چۆن ئافرەتێك ببێت، کچە، یاخود ژنە، بالەبەرزە، یان هەندێ گۆشتنو خڕپنە... هەمووش بە پەلەن ؟ دەبێ ئاهەنگێکی خۆش و بەتام لەم دەوروپشتەدا**

**سازکرابێ...؟ ئێ ی ی بە من چی ی ی ی..! کەی من کـوڕی ئاهـەنگەو زەمـاوەند بـووم، هەمیشـە دەردەسـەری‌و بێوڵەی لە یـەکـەم ڕۆژی لەدایکبوونمەوە بوونەتە خەڵاتم، نە ئەوان بێ من هەڵدکەن نە منیش بێ ئەوان ژیان و حـەوانەوەم هـەیە.... ئـا ئەمـەیان گـوڕەی ئۆتـۆمبیلە، لەوانەیە شۆفیرەکەی خۆاپێداوێکی وەکو «کوێخا عـەودل» بێ و «نازە» یێکی شۆخ‌و شەنگ لەهاوشانیدا بۆی بتریقێتەوە...».**

کـەچی ئەویـان دا بەنێـرە مووکێکی وەکـو «کوێخـا عەودل» و تـاوانی کوشتنەکەی «نازە»ش خرایە ئەستۆت، بە هەمان ڕەواڵەت زندە بەچاڵیان‌کرد،.. ئەوە بوو بە هەشت ساڵ، ئەو مارو مێروانـەی گۆشتی جـەستە سپیـەکەیـان نۆش‌کرد، ئێستا ئەوانیش بوونەتە پەینی دێراوی ڕەزەکانی «کوێخا».

دەنگـەکان تـا دەهاتن بـەرزتر دەبـوونەوە، قـوژبن و کەلێنـەکانیـان، دەپەستانەوە.. پتر خـۆت متکرد بـە دیوارەکـەوە، زەڵەو بوڵەی شـەقامـەکە بـەحەپـەساویـەوە بێدەنگیی ژوورەکـەیان دادەچـەڵەکانـد **«ئـەوەتـا ئـەم ئافرەتانەش لە کۆشی ئەهریمەن کەوتوونەتەوە لەهێچ سڵکردنەوەیـان نییە، بگرە بوونەتە ئامێرێکی چاك بۆ خەساندن و خرپنالکردنی زۆربەی ئەو خەڵکە. ئەی ئیتر بۆچی دەڵێن لە پشتی هەموو پیاوێکی مەزنەوە ئافرەتێك هەیە. ئەی ئیتر بـۆچی بە جـلو بەرگی لووس و تـەسکەوە سـەرنجی شێتانەیان کوێردەکەن، شانەکانی لەشیان کردۆتە زمانی ئارەزوو.. کورد دەڵێ ژن و ژان، ئەمانە نەك ژانن بگرە ڕووزەردیشن.. بەلام «نازە» ژن بوو.. هەرگیز ژان نەبوو، خۆی نەدایە دەستی «کوێخا عەودل» وە، تائەو ڕۆژەی زیندە بەچاڵیان کـرد، زریکەی لە کـۆڵانەکـانی گونـدەکەو کشت گـوندە هەشبەسەرەکانی هەموو دونیادا دەنگی دەدایەوە.. دەڵێن ئێستـاش لە سەرلووتکەی شاخی ژوور سەری گوندەکەوە، هەموو ئێوارەیێك تیشکێك گڕی سوور لە گۆڕەکەیەوە بەرز دەبێتەوە.. چونکەش ـ مەلا ـ فتـوای دابوو لە گۆڕستان نەنێژرێ لەسەر لووتکە شاخەکەی ژوور ئـاوایەوە خەڵك و خوای گوندەکە بەخاکیان سپاردوە...».**

● ● ●

ئەم چوار دیوارە تاریك و نتکە هـاودەمتن، لەگەڵ یـەکەم کلپـەی گڕی ئاگری ـ ئاهورا مزدا ـ دا بوونەتە خەلاتت... ڕۆژگار هەرئەو ڕۆژگارە بوو، ژوور لێت بێزار بوو، کەچی تۆ لە ژوور بێـزار نەبـووی، ڕاهاتبـووی، بەتـەنیایی و سەرگەردانیەوە بۆ ژوورێکی تر دەگەڕای.. ملێونەها ڕوودا ویش لەو ڕۆژگارانەدا

مرۆڤیان دەکردە دانە مرواری ملوانکەی خویناوی چەرخێکی پیرو کەنەفت..!
خوێنەری ئازیزو دڵتەنگ، دڵنیایم بە سەریەشاندنت، خەمەکانی ئەم گەردونە گێژویژە ئارام ناگرێ، یان مەترەلۆزەکان هەتا هەتایە کپ نابن، ئەمەیش تەنیا گرێ کوێرەی دڵی پڕ خەمی - ڕێبوارە - بۆ باوکە دەنگوباس بڕاوەکەی دەیکاتەوە:- «بابە، بوومەتە گڕۆڵە پەتی دەستی سەردەمێکی جادوباز، ناونیشانم بێووڵاتیە، مووچەو بەراتم هەژاریی و کلۆڵی و سەرگەردانیو ڕەنجم بۆ خەڵکیە، شوناسنامەم پلیتی تێپەبوونی قاچاخچیەکانە. لە هەموو بازاڕەکانی سنوورەکاندا وەکو ئافرەتێکی کوێلە لە گەڵ تلیاك و بەنگو دۆلاردا دەمگۆڕنەوە، زۆرجاریش بە گاڕامێك دەمکەنە پاسەوانی کاروانی قاچاخچیەکان و هەندێ جاریش دەبمە سەرجەلەکێش و ڕێگا تەریكو باریکەکانیان بۆ دەدۆزمەوە، خۆ زۆر وەختیش دەبمە کوژەرو کوژراو، خوێنەکەم بۆ چاوەزار دەپرژێننە سەر هەگبەو بارە پڕەکانەوە، لە شارانیشدا بۆیان دەبمە مێزی خواردنو شووشە ئارەقو پێك، یان بۆ پەڕینەوەی سنوورەکان دەمکەنە بەیداخی ئاشتی و لەنەتەوە یەککرتووەکاندا دەبمە کاوێژی کۆڕی دادگای دەولەتان، لە زۆر شوێنیشدا دەبمە دیزلو ڕۆنی ماشین و ئۆتۆمبیلەکانیان...
ئای... کە ئاژەڵیش لە باخچە و دارستانەکاندا بە بێ ڕست و پسوولە سەردانی یەکتردەکەن، و مۆڵەتی ژیانی ئاسوودەییان زۆرە، ئەگەربێتو ڕاوچیەکی مرۆ نەیکاتە نێچیر.. کەچی وەکو دەعبایێك خێسەیان لێدەکردم، ئەو دەمە بەرەو ئەو ژوور نەگریسە بوومەوە، چ پسوولە وپێناسێکم نەبوو بە مانەی بسەلمێنێ ئادەمزادم، منیش وەکو ئەوان جووتێ چاو، دووگوێ، دەمو لووتێکم هەیە.. بەڵێ.. بەڵێ.. ئادەمزاد، دەتووت لە تاشەبەردێکی کرمێ و گەنیوو دایانتاشیبووم. مێڵی گلێنەکانم بوونە پشکۆو جزەیان لە کاسەسەری کەتەکە هەستاند، بەرقێکی درۆزنانەوە خۆم کرژکردەوە، چەشنی کۆمەڵە مێرولەیێك گەماروٚی مێشکی نەخۆش و لات بدەن، یەك یەك بە چاوی دەرپۆقیوەوە بۆم دەهاتن..

بەکێشیان کردم بۆ ئاستی دڕینده زمان درێژەکە، نەڕاندی..
- ناوت چییە..؟
- . . . . . !
- کاروپیشەت چییە ؟
- . . . . . !
- کەی لەدایك بووی..؟ کەیش دەمری...؟

ژنت هێناوه..؟ ئەگەر هێناوتە کەی تەڵاقی دەدەی ؟..
منیش نازانم چ هەستێك بوو تەڵەکە دێرینەکەی دەمی تەقاندم، وەڵامم دایەوە:ـ
ـ ناوم بە باشی دەزانن، بگرە ناوی ئەو ئافرەتەش کە هەموو شەوێك بەدزی مێردەکەیەوە باخەڵی باوکمی گەرم دەکردەوە..
ـ کارو پیشەم گەڕانە بەدووی ئەوەی وا لە ژێر زمانتاندایە ودەترسن بیدرکێنن، چونکە نان بڕاو دەبن...
ـ رۆژی مردنیشم هەر ئێوە دەیزانن.. نە ژنم هێناوە، نە دەسبەرداری زیندەبەچاڵ کردنەکەی «نازە»دەبم.. «کوێخا عەودل» خۆی ئەوی کردە دیاریی دەستی بۆ شەوباخەڵی میوانە شارییەکەی، هەر خۆیشی فەرمانی زیندەبەچاڵ کردنی دا «سێ چۆلەکەی بە پەلارێك کوشت.»..!
بابە.. لەیادمە دایکم بەدەم لالانەوەی نەخۆشیەکەیەوە پێ‌دەووتم:ـ
«خەمەکانت لە زەویەکی پاراو و تێر ئاودا رووان، سات بە سات لەگەڵ چرۆی ژاکاوی تەمەنتدا دەبنە دوو پەناهەندەی ڕێگای هاتو نەهات، دەمرم، وکولیتی ژووره ۳ مەتره چوار گوشەییەکان دەبنە ئارامگای تەنگەژانی غەریبیت». دوێنێ شەو بوو، دەشێ پێرێ شەویش من ئێستاکە لە یادم‌چۆتەوە، یان پەسر پێرێ شەو، شەوکانی‌تریش، ملیۆنەها شەو، بگرە خەو و سەرنانەوەی زۆربەی رۆژەکانیش، لەوانەیە ئەمشەویش، سبەشەویش، دەشێ تا من و تۆکوڕو باوك بین، تا زۆربەی ئەم خەڵکەش باوك‌و کوڕی یەکتر بن، هەتا.. هەتا.. هەتایە، ئەم خەون و مۆتەکەیە لەگەڵ سەرنانەوەی خەو وشەونخوونی شەوگارەکاندا، وەکو زامێکی بە سفت‌وسۆ، لە ئاوەڵەی دیدەکانماندا هەو دەکاتەوە وتەراتێن‌دەکات.. لە خەونەکەمدا: «گۆڕەپانی پشووی بەندیەکان، ببووە یاریگەی کۆمەڵێك تارمایی، بەیەکادەهاتن و چنگ لەسەرشان بەدووی یەکترەوە بوون، کەلەسەرێیکی کولکن بەدەم شەقی پێیانەوە خل‌دەبۆوە، بۆ چەندجارێك کەلەسەرەکە چاوەکانی دەچووقاندو دانەکانی گیردەکردەوە.. ئەوانیش ئەوەندەی‌تر شێت‌گیر دەبوون، خۆیان شپرزە دەکرد، هەڵەتیان بۆ یەکتردەبرد، . کەلەسەرەکەیش بەپێکەنینێکی بەختەوەرانەوە بەرەنگاری پێڵاوە ئاسنینەکانیان دەبۆوە.. مایکرۆفۆنەکان دەنگەکانیان دەمژی و هیچی‌تر.. سەربان‌و کلاورۆژنەی ژووره بێ ژمارەکان، هەزار، دوو هەزار، سەد هەزار، ملیۆن کەلەسەر بەقامیشەوە کرابوونە دارەوە، هەمووش پێدەکەنین..
دەڵێن سەرەتای پەیابوونی تۆپی پێ، کەلەسەری مرۆڤیان دەکردە تۆپ، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ـ رۆمانەکاندا، سەری دیلەکانیان دەپەڕاندو

ئەفسەرەکان دەیانکردنە تۆپ، ئەڵبەتە یارییەکەی ئەمانگەلیش جـۆرە لاسایی کردنەوەیەکە...!

دەنگ، جگە ریکـۆردەکان شتێکیتـر نووزەی لێـوە نەدەهـات، مرخێش مرخێش، قاوقیژ، فیتووفات، گۆرانی، چەپڵەریزان، دەنگی چەقەنەی ئەمووستی ئارتیستەکان، ئەم هەموو بەسەرهاتە بەدەم شەپۆلی رژانەوەکەم لەتریان‌دەدا.. ئەوەندەم ئاگا لەخۆ بوو، بەسەر کەشتیەکی پۆلاینیەوە جەرەبابە دراوم، شەپۆلە ووردە بەلەسەکانی دەریا لێم کەوتوونەتە هەرەشە و گـورەشەکـردن و بەرەو لیپۆزی کۆمەڵێك نەهەنگی نەوسن شۆرم دەکەنەوە..!

هەرکە وەئاگاهاتمەوە، تـاریکیی ژووره بێچراکـەم خەستتـر بۆتـەوە، دەنگی سیسرك و قالۆنچە و زیکەی مشکەکان لەژوورەکەمدا پەخواردۆتـەوە. بابە.. گەر هاتمەوە، ئەنکیدۆ و گلگامش لە خرۆڵکەکانی خوێنەکەمدا هەڵدەگرم، هەروەکو چۆن نێرکی تووێیکی زڕ دەقەڵەشێنێ، دیسانەوە دەبمە مەلۆتکەو تۆزو گەردی غەریبیم دەکەمە حەتۆتەی چاوەڕوانیی.. هەناسـەی، ساردم دەکـەمە مەدالیایی حەزێکی بێپایان و دەیکەمە گەردنی هەزارەها «نازە»ی شەرمنی ئەم خاك و خۆڵەوە، بە سەر گیاوگژی رۆژگاردا تلاوتل دەکەم..».

* * *

رێبوار..! باوکت بارونبەی گۆاستۆتەوە بۆ شـار، ئێستاکـە خانـووبەرە تەریکەکەی دامێنی گەرەکـەکە بـۆتە قـەلغانی تیـری زۆربەی رێبـوارەکان.. سەرگوزشتەی نادیاریی تۆ، دەبێتە نووالەی توێشەبەرەی هەواڵەکان، شار بە شار، کیشوە، بـە کیشوەر، دەیگێـرنەوە. منـاڵەکانیش بـە دێوەرەو چـەرچیی هەواڵەکانەوە خۆیان هەڵدەواسن، بـاوکیشت تا ئێستـا بلێی پلیتی ـ خـوت‌و بەختت ـ ی راکێشابێ، هەموو ئێوارەیەك لە نیوەی پەیـژەی سەربـانەکـەدا رادەوەستێ، رووە و قیبلە دەستە لە رزۆکەکانی بەرەو ئاسمان پان کردۆتەوە...

**کرکوك مارتی ١٩٧٩**

---

ئەم چیرۆکە لە کوڕێکدا لەگەڵ دووچیرۆکیتردا لەهۆڵی کۆمـەڵەی رۆشنبیری کـوردا لە ١١/٤/١٩٨٢ خوێندمەوە...

# ئاوڕ شێن کرابوو......

بکر حسن

بۆ ! تەرزە چی ناکا لەم شارەدا.. بۆهاوێن و زستان دەناسی ؟ هەچ کاتێك بیەوێ، زۆر بە ئاسانی ی دەیدا بە تەپڵی سەرتدا بۆئەبەدیەت دەتخا.. ئیتر منێك کە باوکیشم هەر بە تەرزە ڕۆیشتنبێ و مردبێ.. چۆن لە تەرزە نەترسم لە بەرئەوە پەلەمەو تەنیا ـ نیو چارەك ـ ئارەقم بانگ کردووە.. دەیخۆمەوە زوو هەڵدەستم، لە ترسی تەرزە !! من پڕ بە دەم هاوار دەکەم ترسنۆکم.. لە تەمەنی دە.. ساڵانەوە لە باوەژنەکەم دەترسام هەتا دوانزەساڵی لەو کاتەشەوە لە تەرزە دەترسم.. هەمووکات واهەست دەکەم شتێك بە دواماڕادەکات.. دەیەوێ ڕۆحەکەم

لێستێنێ.. دەیەوێ بمخوا.. ئیتر.. عەبەمۆن.. تۆ بۆچی ئاوا.. مۆڕەی تیژوو تووڕەم تێدەگری.. و.. تۆ بۆ مۆری تاوانبارێتی دەنێی بە ناو چاوانمەوە.. ها.. ئەی ئەی عەبە.. مۆن.. بریا لە سەر ئەم مێزە دانەنیشتمایە.. ئەوەتا شکم لە خۆم پەیدا کرد.. کێ دەڵێ تاوانبار نیم ناهەقی ناگرم ! لەوانەیە ئێستا زۆڵێتیەکەی خۆی !! ئوە.. بمبورن ویستم بڵێم، ئێستا مۆنێتیەکەی خۆی لە چاوی مندا دەخوێنێتەوە.. دەزانم گەر بۆی بکرێ زمانی من لە پێش زمانی هەموو کەسێکدا دەبڕێتەوە چوونکە هاوڕێی مندالیمە وە لە دەمێکەوە دەیناسم.

بەڵێ، ئەو عەبە مۆنەی کە ئێستا تەنیا مەترێک دوور لە مێزەکەی من وانیشتووە و جار جار چاوە تووڕەکانی لە سەر من هەڵدەگرێ ولە سەر هێڵێکی سی پلەیی لە منەوە بەرەو سەر ئەو چوار کەسەی دەبا کە لە مێزی سووچی سەرەوەی ڕیزەکەی من دانیشتوون، ئەوانیشی بەر مۆڕەو چرنوقی چاوە مۆنەکانی داوە.. ئوە.. خوایە.. ئەو زەردە خەنەیە چی بوو ! سەیرە دوو دڵیم پەیدا کرد.. دەڵێی عەبە ـ نی یە.. نا.. خۆیەتی و عەبە زۆڵە.. ئەمجارەش بمبورن..من ئەبەد نامەوێ ئەو بزمارە ژەنگاوییە لە سەر ناخی بچەقینم.. زەردەخەنە کە مرد.. دەم و چاوە ڕاستیەکەی لێدروست بۆوە خۆیەتی !! ئنجا کە لێوەکانیشی ئاوا بە تەڕی دەردەکەون و هەناسەی گەرم لە سەریان دەخنێتەوە.. ئەوە ئارەزووی تەڕی ئەو پێکەیە کە لە بەر دەمیدا دانراوە پێکێکی گوناهە. تاساوە.. وا خەریکە دەبێ بە هەڵم.. تەماشایەکی ترم دەکا.. ئەمجارەیان ترس نینکۆك لە لەشم تووند دەکا.. وا هەست دەکەم سەرمایەك دای لە گیانم.. گشت پێستم هەڵتۆقی.. چۆن نەترسم.. لووتە درێژەکەشی لێم هێنایە پێشەوە.. جگە لەوەش هەمووی هەر دوو هەفتەیە لە بەندیخانە هاتۆتە دەرەوە.. بێ گومان دوو ساڵ بەندیخانە دوو چاوی جوان و ئەفسوساویش کیویلەیی دەکا..ئنجا دەبێ دوو چاوی وەك چاوانی عەبەمۆن چییان لێبێ.. کە هەر لە سەرەتاوە هەر لە مندالیەوە.. مۆن و تووڕە ڕووا ون، ئێستا بە دوو چاوی سەرۆکی هێزێکی کۆنی ئیسلامی دەچێ، شمشێرێکی بە دەستەوە بێ.. ڕایوەشێنێ سەری کافر بپەڕێنێ.. چی بکەم لەوە زیاتر ناتوانم باسی چاوەکانی بکەم.. ئنجا گەر زمانی ئینسان بیتوانیایە لە هەموو شتێك بدوێ و هەموو نهێنیەك بدرکێنێ.. ئەدی ئەی بۆ ئەو گرێ کوێرانەی بەم ڕۆژگارە ڕوحمان دەگوشن بۆ بە زمان ناکرێنەوە جگە لەوە کێ هەیە، لەم سەر زەمینەدا بەکۆمەڵێ نهێنییەوە سەر نەنیتەوە.. کۆمەڵێ نهێنی نەباتە گۆڕەوە لە سکی زەویدا نەیخنکێنێ تەنیا شێتەکان نەبێ. هەر لەبەر ئەوەشە ئێمە هیچ نرخێك بۆ شێت دانانێین ـ لە بەر ئەوەی درکاون.. تەواوبوون، نرخە کۆمەلایەتیەکەیان دابەزیوە.. گەر واش نەبێ من هەر ناتوانم تەواوی

نهێنییه‌كانی دوو چاوه سه‌یره‌كه‌ی عه‌به‌تان بۆ بدركێنم.. ئنجا گه‌ر بمتوانیایه مانای ئه‌وه ده‌بوو كابرایه‌كه‌ی ته‌واو و پێكه‌یشتوو ده‌بووم وله ئازاری هه‌موو كه‌سێك تێده‌گه‌یشتم !! نه‌خێر پێناگه‌م، له به‌رئه‌وه‌ی پاش پێگه‌یشتنم.. ده‌مرم !!

ده‌شترسم و پێكه‌نینشم دێ.. به‌زه‌ییم پیایا دێته‌وه.. هه‌رچه‌نده ئینسان زۆر له به‌زه‌یی پیا هاتنه‌وه‌دا گه‌وره‌تره.. له ترس و پێكه‌نین و ئاگا له خۆ نه‌بوونه‌كه‌مدا په‌ڵه‌یه‌ك ماست ده‌كه‌وێته سه‌ر پانتۆڵه‌كه‌م.. به دزه نیگایه‌ك له عه‌به ده‌ڕوانم، پێده‌كه‌نێ.. له گه‌ڵ پێكه‌كه‌یدا خه‌ریكه، ورێنه ده‌كا.. هه‌ریه‌كه‌م پێكه‌كه‌یه‌وهێشتا نه‌یخواردۆته‌وه.. سه‌ری به‌ره‌و ده‌رگاكه ده‌با.. ته‌ماشایی ده‌ره‌وه ده‌كا.. چاوه‌كانی ئه‌بڵه‌ق ده‌بن هه‌روه‌كو گوێ له سه‌مفۆنیایه‌كی ئازار بگرێ.. سه‌مفۆنیایه‌ك به‌تاڵه‌كانی ڕۆحی لێبدرێ.. ئاوا لێوه‌كانی ده‌كه‌وێته سه‌ما.. فوو له غه‌مێكی ڕه‌ق ده‌كا.. له ناكاودا گریانێك دێته‌گوێم، به‌ئاسته‌م دێته‌گوێم.. وا هه‌ست ده‌كه‌م عه‌به‌یه‌و له سه‌ر گۆڕی خۆی.. گوڵ ئه‌نێژێ.. گریانه‌كه وورده.. وورده.. زیاد ده‌كا.. نزیكتر ده‌بێته‌وه.. كوڵتر دێته‌گوێم.. دڵنیا ده‌بم عه‌به نی‌یه..و.. خۆشم نیم.. سه‌یرتان لێنه‌یه‌ت گه‌ر بڵێم.. زۆر له‌و جۆره گریانه له ناخی خۆمه‌وه هه‌ڵقولاوه.. گوێم لێ‌بووه.. له گه‌ڵیا سه‌مام كردووه.. سه‌مایه‌كی ده‌روێشانه.. خۆشم‌نیم گریانه‌كه دێته ژووره‌وه.. هۆڵه ساردكه‌كه‌گه‌رم دادێیت. كابرایه‌كی جل چڵكن و بالابه‌رزه، دیوانه‌یه.. فرمێسكه‌كان ڕوومه‌ته‌كانی وه‌شۆنه‌وه.. له چاوه‌وه.. پاك بێگه‌رد له ده‌ره‌وه ڕه‌ش و قه‌ترانی.. عه‌به سه‌ری لێبردۆته پێشه‌وه.. گریانه‌كه ده‌ناسمه‌وه، چاك ده‌یناسمه‌وه، حه‌مه گرینۆكه.. حه‌مه گۆچان دزه.. كه گۆچانی به پیره‌مێرده‌كانی شار نه‌هێشتووه.. سه‌یرئه‌وه‌یه له ئافره‌تی نافرێنێ !! چاكی ده‌ناسمه‌وه‌چۆن، نایناسمه‌وه.. یه‌كێك له پاڵه‌وانه‌كانی شه‌وانی ته‌نیاییم.. هی ناو ئه‌لبومه‌كه‌م.. كه هه‌موو شه‌وێ تێر بۆنی زه‌رده‌خه‌نه‌و گریانه‌كه‌ی ده‌كه‌م.. هه‌قیقه‌تی شته‌كانی كه‌للەمه.. ئه‌لبومه‌كه‌م جێگای هه‌موو شێته‌كانی‌شاره...

حه‌مه گرینۆك به چوار ده‌وری هۆڵه‌كه‌دا ده‌سوڕیته‌وه.. عه‌به‌ش هه‌ر وه‌ك چه‌قی ئه‌و بێت و قاچی دووهه‌می ئه‌و له سه‌ر سه‌ری ئه‌وبێ، له گه‌ڵیا ده‌سوڕێته‌وه له ناكاوێكدا گوێیه‌كانم كپ ده‌بێ، هۆڵه‌كه كپ ده‌بێ.. حه‌مه گوڵی ده‌نێ به دیواری لای ڕاستی هۆڵه‌كه‌وه.. زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌ك ده‌كه‌وێته سه‌ر لێوی.. سه‌ر دوور ده‌خاته‌وه.. ته‌ماشایه‌كی خه‌ڵكه‌كه ده‌كا ده‌كه‌وێته سه‌ما.. به منداڵێكی دووساڵان ده‌چێ.

(خەڵکەکە پێ دەکەنێ)

هاواردەکا: بەس.. بەس
(دیسانەوە گوێ دەنێتەوە بە دیوارەوە
عەبە هەڵدەستێ بەرەو ڕووی دەڕوا)
- ئەوە چیتە ؟!
(بە ئیشارەت لە عەبە دەچێتە پێشەوە)
- گوێ بنێ بە دیوارەوە
- کوا هیچ نی یە
(بە سەر عەبەدا دەقیژێنێ، و دەست دەکا بە گریان.. هۆڵەکە دەنگ دەداتەوە).
- چۆن گوێت لێ ی نی یە.. کەواتە دایکم مردووە.. چۆن ؟ ئەی بۆ من گوێم لێیەتی.. ووس ووس.
بەپەلە گوێ دەنێتەوە بە دیوارەکەوە.. هەڵدەکوتێتە سەر عەبە، جارێکی ترو.. دووان گوێ دەنێتەوە بە دیوارەکەوە.. دەست دەکا بە دایکە ڕۆ ڕاستە زۆر ڕاستە دایکمی.. ئەو باوکە چەپەڵەم کوشتی.. بۆیە ناگری.. بە گۆچانەکەی کوشتی عەبە دێتەوە جێگای خۆی.. زۆرم پێ سەیرە.. دەبوایە بەر بۆکسە وورچانەکەی بایە.. لە یادمە، چاك لە یادمە.. کە چۆن جارێك بەر چەپۆکە وورچانەکەی دام.. وا دەزانم ئێستایە.. مندال بووین، پێکەوە لە حوجرەکەی مەلا سەید کاکە بووین، لە ڕاستیدا ڕۆژەکەم لە یاد نی یە.. بەلام بیست سال لە مەوبەر بوو.. دەتوانم بە چاکی بۆتان بگێڕمەوە، بەلێ من تا بلێ ی مندالێکی لاسار بووم.. ڕەقوتەق هەروەکو دەستەکانی دایکم.. خوا لێ ی خۆش بێ کە ئەوەند لاوازبوون هەر چەند لێیدەدام.. دەتەزین.. هەر وەك ئەوەی کێشابێتی بەم وورده سەهۆڵەی بەردەممدا.. تا ڕۆژێکیان کە زانی لێدان و هەڕەشە سوودی نی یە، بە عەلی برامی ووت:
- بڕۆ ئەم ڕەقە مارەم لە کۆل بکەرەوە.
عەلی برام بردمی بۆ حوجرەکەی مەلا سەیدکاکە، دۆشە - کەڵەیەك ویەك دوو کیلۆ خەلوزیان خستە بن هەردووبالم، دوو ڕۆژی پێنەچوو کە ئەم عەبەیەشیان هێنا، عەبە دانیشت، چاوە مۆنەکانی بە هەموومانداگێرا.. تەماشایەکی منی کرد.. مۆڕەیەکی لێکردم.. زمانێکم لێدەرهێنا.. ڕووی کردەوە ئەودیو، ملپێچەکەم دەرهێنا.. سێ گرێ کوێرەم لێدا... بێ ئاگا بوو.. کە دووزرمەم لە پشت ملی هەستاند.. هاواری لێهەستا، وورچ ئاسایی بەر چەپۆکی دام، خستمیەناو ئەوتەنەکانەوە کە لە سەری دانیشتبووین، هەرچی دەم و چاوم بوو

خستمە بەر شالاوی بۆکسەکانی، تەنیا لە بەرئەوەی چاوم لە مامۆستابێ، کەی بە خۆیو گۆجانەکەیەوە بۆمان دێ، ئاگام لێبوو.. مامۆستا قاچێکی بەرزکردەوە، هەنگاوێکی هاویشت.. قاچی لە سەر مقلیەکە گیرسایەوە، ئای خوایە.. چی لێهات.. هەرچەند پشکۆ لە قاچی دەکەوتە خوارەوە هێندەی کیلۆیەکی ئاسن دەبوو، زیدەی دەگەیشتە گوێی کەڕ !! دوعاو جنێو.. سوودی نەبوو.. ئەو کەوتو ئێمەش رامانکرد. کە چوومەوە ماڵەوە.. پاش ئەوەی کە دایکم دەستەکانی لە لەشە ڕەقوتەقەکەما تەزاند، پێی ووتم:

- خوام لەو خوایەی جارێکی تر لەو هەتیوە بێ دایکو باوکە بدەی.

لەو جارەمن زانیم کە پورە مەنیج دایکی عەبە نی یە. بەڵێ ئەو نهێنیەم زانی کە عەبەی ئاوا لێکردووە، وام لێهات لە دەرەوەش پێم دەگوت.. عەبە زۆل ئەی عەبە زۆل. چۆن بیری دەچێتەوە.. ئەو بە گرێ کوێرەی ئەو نهێنی یە گەورەبووە، ئەو نهێنی یە لای هەموو کەس درکاوە ئێستا چۆن لە چاوەکانما نایخوێنێتەوە.. کێ دەڵێ ئێستا چاوەکانی من دەستاو پەنجە لەو نهێنیە دروست ناکا دەست بنێتە ملیو هەناسەی توندکا، ئای عەبەمۆن، ئەی عەبەی هەناسە سارد، وەرە دەی وەرە، ناهەقت ناگرم.. دەی وەرە زمانم ببڕە وبیسووتێنە، هەقی خۆتە. بەلام ئەی بۆ پێکەکەت ناخۆیتەوە خۆ وا ئەویش هەناسەی تیا نەما، کەی ئەو کەسانە.. ئاهێ بە حەزە ڕەشپۆشەکانت دەهێنێ.. دی وەیخۆ، پێکەکەت وەخۆ.. ناخەکەت بیابانێکی ووشك و سووتاوە.. چاوەڕوانی هەناسەی تەڕی ڕێبوارێکە تینوێتی بشکێنێ و سەوزی بکاتەوە.. چاوەڕوانی دەنگی پێی ڕێبوارێکە.. بیهەژێنێ بروسکەو زریانی پێبێ.. مژدەیەکی باتێ. ناهەقت ئاگرم لە دەفتەری ژەنگ هەلاتووی چ چیرۆك نووسکێدا هەیە، باوك لە دادگا هاوار بکات.. بلێ:-

- کوڕی من نی یە.. زۆلە، گەر بەرم بدەن.. ئێستا دەچم ئەویش دەکوژم.

خۆ ئەویش مرد، گەر لە بەندیخانە نەمردایە وبەربوایە.. ئەوە یەکێکتان گوڕتان بۆ ئەوی تر هەلدەکەن وتەنیا کێلێکیشتان بۆنە دەکرد بە نیشانە !! ئەویش لەوانەیە هەر بە داخی زۆلێتیەکەی تووە سەری نابێتەوە. خۆ هێشتا تەپو تۆزو چلکی بەندیخانە بە سەروقژتەوەیە.. ڕەنگت لە ڕەنگی چوار دیواری بەندیخانە دەچێ. وات هەست کرد گەر بچی ئەوراقەکانی تاوانەکەی بابت لە ئارشیفی دادگا دەربهێنێ.. ئەوکاتە بۆخۆشتو بۆ خەلکیش دەسەلمێنێ کە دایکت تاوانبار نەبووە، بەڵێ هەر دەبێ وابێ.. وەکو ئەوەی باوکیشتا لە بەندیخانە ووتبووی.. کەسێك بوو قینی ئاگرێکی کۆخا لە دلدابوو بێو ئەو بەزمەی بۆ دروستکردبن.. ئینسان هەر چۆنێك بێ، هەقی کوشتنی نی یە ! باوکت تاوانبارە.. ئای بۆ ناخی سووتاوت.. فریانەکەوتی پێش ئەوەی بچیتە ژووری ئارشیفەکەوە دووپولیس

گرتیانی.. هەر دەبێ خاوەنی هەناسەی ساردی خۆتابی، تازە مورەو بە ناوچاوانتەوەیە، خۆ بە پێستەکەتەوە نیە.. بیگۆڕیت و بیسووتێنی. خۆ ناشبیتە مارو بە کاژێك فرێ‌ی دەی ! یان بە دەستێك بە قاچێکتەوە نی‌یە.. بیبڕیتەوە و گوڕێ بکەی. حەیا ناشاردرێتەوە.

ناسووتێنرێ وەك دەنگ وایە.. لە ئاسمانیشدا دەمێنیتەوە، هەتا.. هەتایە.. هەر زیندووە. لە هەموو شتێ بەرزترە لە ئاستنی ڕوحدایە.

دە بیخۆرەوە.. پێکەکەت وەخۆ، شەپۆلێ ماچ بە لێوەکانتە وە، دیارە، لە ماچی بێ‌دەنگ خۆشتر نی‌یە لای تۆ، کەللەت کاسەو نایەوێ گوێ‌ی لە دەنگە دەنگ بێ، ڕۆحت زکرێکی دەروێشانە دەکا.. هێمن.. هێمن لێوەکانت سەما دەکەن. ڕۆح وایە. لە گشت نهێنەکان دەزانێ.. مەزنترین زمانی هەیە.. بەڵام هەر خۆت دەدوێنی.. مەزنترین.. گوێ‌ی هەیە.. لە هەموو ئازارێکت تێدەگا..لێوەکانت سەرت پێ بەرزدەکاتەوە دەڵێ‌ی منداڵەو چاو شارکێ دەکا، باو.باو، دەکا، ئەو چاوانەی لەوەتەی هەن.. هەر تووڕەبوون.. ئێستا بە زەردەخەنەیەکی جوان.. تەڕ دەبنەوە، ئەو فرمێسکانە پێدەکەنی، چاوەکانی، پڕ دەبن‌لە لەزەت..لەزەتێکی سەر هەڵگرتوو، ئەو بە سواری ئەسپی گزنگەوە ئەمیش بە پێیە قورسەکانی خۆیەوە.. دوای نیگاکانی دەکەوم.. لە سەر مێزی چوار کەسەکە دەیوۆزمەوە لە ناو شووشەی ئارەق و مەزەی جۆراو جۆردا دەیدۆزمەوە. ئەوان هەر بەقسەو خەیاڵ بوونی خۆیانەوە خەریکن، تەماشایەکی پێکەکەی دەکاتەوە وەك ئەوەی بەزەیی پیابێتەوە !! ودەڵێ:

ئاخ.. خ.. خ
دە سەد داخ
بۆ لیێم نابیتە شەوێکی پڕچ تۆزاوی مات
شەوێکی کفن زەرد
سەرم بە لای سنگتەوە نێم
هەڵژم تام و بۆێ هەناسەت
ئای کە خۆشە
خەوێکی ئەبەدی بمباتەوە
ببمە سێبەرێکی ڕووت‌مات
وەك سێبەری
درەختێکی
ووشك هەڵتووڵق و پۆپ کەوتوو

وەك سێبەری پەڵە هەورێکی خێـرا ڕەوت
هەست دەکەم وولاتی خۆمم دۆزیوەتەوە
هەست دەکەم «هەم !!»
ئای دە سەد داخ
ئاخ.. خ.. خ.. خ

هەر بەو زەردە خەنەیەوە سەر بەرزدەکاتەوە، نازانێ چ لە سەری بکا. لە ناکاودا، توورە دەبێتەوە کەللەی دەبێتە بورکانێك‌و ئاگر لە لێوە ئەستوورەکانی دەکەوێتەوە.. تەماشایەکی پێکەکەی دەکەم.. بەزەییم پیادێتەوە.. گوناهە، بەو بچکۆلەییە دەبێ جێگای ئەم هەموو گریان و حەسرەتەی تیا بێتەوە:ـ

گەر قاچم تەختی ئاوی بگرتایە
گەر شەپۆل لە ئامێزی بنامایەو
نوقمی نەکردمایە
ڕێی رووبارم دەگرت
بۆ دەریا لووش
خۆم دەدایە بەر هەناسەیەکی
ـ برمۆدا ـ[1] سێ گۆشە ییەکە
هەرچی ووشکاییە
لە باوەشما دەسووتاند

*     *     *

هەناسەت دەشنێ
دەرگای دڵەگەم دەکاتەوە
نهێنی کەللەم کۆ دەکاتەوە
دەیکاتە پێکێ.. پێکێ خەست
هەر ئێستا نا هەندێکی تر دەتخۆمەوە
هەر خۆم دەزانم بەرەو
چ گێژاوێکم دەبا
بەرەو ئاوی ئامون
توونی بابا.. کەس نەزان
دەبما..
لەوێوە بانگت دەکەم
شاکۆچەکەم، شاکۆچەکەم
جا ئەوە ڕۆحی خۆم

دەیکەمە کەشتی
هەر دوو باڵم سەوڵ
دەی.. دە بمبە
خۆ ئێستا سواری ئەسپی ڕۆحی خۆمم و
لە هەناسەی کەس ناپارێمەوە
توخوا.. بمبە
هەر بۆ تاوێ
شاکۆچەکەم
تەواو دەکەم !

سەری بەرزدەکاتەوە.. تەماشایەکی چوارکەسەکە دەکاتەوە، قیزیان لێدەکاتەوە، چاوەکانی دەخاتە سەر مێزەکەیان.. بە شاگەشکەوە. دەیهێنێتەوە سەر مێزەکەی خۆی، پاشان دەستەکانی توونند دەنوقێنێ.. پەنجەکانی لە دەستیدا دەگوشێ، تەماشایەکی ووردی منیش دەکا،سەرم دادەخەمەوە، خۆم بە تێکدانی ماستەکەی بەردەممەوە خەریك دەکەم، بە جۆرێك کە لێشی بپارێمەوە، لە تاوا دوا پێکی نیو چارەکەکەم تەواو دەکەم.
لە ناکاودا هەنگاوێك دەنێ، دووهەم بە هێمنی، لە سێهەمیندا.. هەر بەڕاکردن.. دەگاتە مێزی چوارکەسەکە، ئاورێك لە من دەداتەوە !!
چوارکەسەکە.. چاك خەیاڵن و خەریکی قسەی خۆیانن.. لە پڕێکدا عەبە پێیان دەڵێ:
- من بۆیە ڕۆژی نیو دینار دەدەمم بەم هەتیوە قژلوولە ناشرینە.. کە جگە لە چارەکی من لە سەر مێزی کەسێك دانەنێ، کەی لێدەبنەوە، ئەوە چیتان کرد (چوارکەسەکە دەدەنە قاقای پێکەنین.. پێکەنینێك یەك پارچە گاڵتە پێکردنی عەبەیە).
- چی یە، خۆتان بەشی خۆتان ناکەن، ها، بەشی خۆتان ناکەن ئەی بۆدەبێ من بەشی شارێك بکەم، بەشی ووڵاتێك بکەم، ها بۆ من چیمە، ئینسان نیم، کێ دەڵێ ڕاست بووە، باوکم درۆی کردووە، بۆیە وای ووتووە، (دەوەستێ تەماشایەکی من دەکاتەوە، چاوەکانی پڕن لە هەڕەشە).
- بۆ ئەوەی ووتووە، تا کەم بەندی بکەن.
چوار کەسەکە دەدەنەوە قاقای پێکەنین.. عەبە چەپۆکێك دەکێشێ بە مێزەکەیانا، یەکێکیان هەڵدەستی.. پاڵێك بە عەبەوە دەنێ.. عەبە بۆی دێتەوە.. بۆکسێکی وورچانەی پیادەکێشی، یەکەکە، شتێك لە سەر مێزەکە هەڵدەگرێ،

دەیکا بە سنگی عەبەدا.. سیانەکەی‌تر ڕادەکەن.. یەکەکە دەمێنێتەوە بە عەبە دەڕوانێ تا بە سەر مێزەکەدا دەکەوێ، ڕادەکات من هەر کەدەگەمە سەری.. دەسلەمێمەوە. نازانم چۆن بگەڕێمە دواوە، ناهەقم نیە، ئای چۆن زەردەخەنەیەك لە سەر لێوانی دەپژێ، بە باڵێکی شتی سەر مێزەکە دەخاتە خوارەوە. مێزەکە پاك دەبێتەوە.. هەموو گیانم دەلەرزێ زەردە خەنەکە ووردە ووردە جوانتر دەبێ، ناسکتر دەبێ.. لە گەڵ ئیقاعی چاوە سەیرەکانیا بە ڕێ دەکەوم، هەموو شتێکم بۆ ئاشکرا دەبێ، هەموو زەردەخەنە جوانەکانی لەوەپێشی کە بە دیارپێکەکەیەوە دەیکرد، لێوەکانی پێ تەڕدەبوونەوە، لە سەر مێزەکەدەم وچاوێك دەبینم.. دەموچاوی ئافرەتێ وێنەکراوە، لە سەر ڕووی‌ئاوی ڕووبارێك وێنەکراوە، بەلام زیندووە، وا هەست‌دەکەم هەناسە دەدا، دەجوڵێ شەپۆل دەدا، شەپۆلێك داوێتی لە قژە خاوەکەی، قژە قەترانیەکەی بە چەندشەپۆلێکی مات پەخش بووە، تاڵەکانی لێکڕ جیابوونەتەوە، کە جوانە چاوەکانی بە سەر شەپۆلێکی هەڵچووەوە بەرزبوونەتەوە، هەموو نهێنیەکانی دەخوێندرێتەوە، گەورەو تەڕو جوان، لە دووچاوی ئافرەتێ دەچێ کە دوای ژان‌و گریانێکی زۆر، کۆرپەکەی لێدەردەهێنن‌و دەیخەنە باوەشیەوە ئاوای دەبینم: دەم‌و لێویشی جوان لە شەپۆلێکدا نزم بوونەتەوە، بە لای چەپدا بە ئاستەم دوو شەپۆلی تری داوە، هەر وەکو بە چەپکێ گزنگ ئاوڕشێن کرابێ.. وایە.. ئەوەندە نوورانیە، هەرچی دەبینم لە زەردەخەنەوخۆشەویستی‌و حەسرەت هەر ئەوانەن کە بە دەم‌وچاوی عەبەوە بینیمن، پێش ئەوەی دوا هەناسە بدات.

١٩٨٢

---

١ ـ مەبەست لەو ناو چەنیەیە، کەلە دەریالووشی ئەتلە سیداهەیەو.. هەرچیەك بەسەریا بڕوا.. تەنانەت لە ئاسمانیشە وەبێ.. قووتی دەداو.. کەس نازانێ بۆ کوێ دەبا.. وە چەندەها کارەساتی تیا ڕوویداوە، وەچەندەها فلیمی سینەمایشی لە سەر وەرکراوە.

**چیرۆکێکی «نیکۆلای نۆسۆڤ»ە**
**محمد حمەصالح توفیق**
**لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویەتی بە کوردی**

---

جارێکیان کە ئێمە ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵە زنجەکەی لادێمان، میشکا هات بۆ سەردانمان تاوەکو لەوێ لە گەڵ مندا بمێنیتەوە. من ناتوانم ئەوەت بۆ باس کەم تا چ ڕادەیەك خۆشحاڵ بووم ! بەڕاستی زۆر زۆرم بیر دەکرد. هەروەها دایەش ئەم هاتنەی ئەوی فرە پێ خۆش بوو.

دایکم وتی: «شتێکی چاکت کرد کە هاتیتە لامان، هەردوکتان دەتوانن بەوپەڕی خۆشی‌و شادمانییەوە گەمەو یاری بکەن‌و ڕابوێرن. باپێتان بڵێم،

---

* **سمۆلینا** خۆراکێکە چەشنی نیشاستەو مەکەرونە لە گەنم دروست دەکرێ پاش لابردنی توێکەکەی.

**نیکۆلای نۆسۆڤ**: یەکێکە لە کەڵە نوسەرەکانی یەکێتی سۆڤێت لە بواری چیرۆکی منداڵ ندا ساڵی ۱۹۰۸ لە کێیڤ لە دایك بووە. لە کتێبە بەناوبانگەکانی [سەرەڕۆییەکانی دۆنۆو هاوەڵەکانی] و [ڤیتیا مالییف لە قوتابخانەو لە ماڵدا] یە کە پاداشتی دەوڵەتی‌ی یەکێتی سۆڤێتی لە سەر وەرگرتوون. تێکڕا ۳۷۵ بەرهەمی چاپکراوی نیکۆلای نۆسۆڤ بڵاوکراوەتەوە ئەمانەش وەرگێڕاونەتە سەر ٦٨ زمان لە یەکێتی سۆڤێت و وولاتانی دیکەدا.

دەمەوێ سبەینێ بەجێتان بێڵم و بچم بۆ شار.باشە ئێوە دەتوانن دوو ڕۆژ هەڵکەن بەبێ من ؟».

- منیش وتم: «بێگومان هەڵدەکەین، خۆ ئێمە منالە کۆرپە نین !».

- «تەنیا هەر ئەوەیە نانی نیوەڕۆ بۆ خۆتان ئامادە بکەن. تۆ بڵێی بتوانن ؟»

میشکا هەڵیدایەو وتی: «بە خوا پرسیارێکی سەیرە، تۆ بڕۆو هیچ خەمی ئێمەت نەبێ !».

- «زۆر چاکە کەواتە شۆرباو هەندێك سمۆلینا لێبنێن، هەرچۆنێك بێت لێنانی سمۆلینا ئاسانە».

میشکا دیسانەوە وتی: «باشە، وا سمۆلیناش دروست دەکەین، خۆ کارێکی هێندە گران نییە».

وتم: «بەلام میشکا، گریمان ئێمە نەمانتوانی دروستی بکەین. خۆ تۆ لەمەوپێش قەت لێت نەناوە، وا نییە !».

- هیچ خۆت مەشڵەژێنە ! من تەماشای دەستی دایکمم کردووە کە چۆنی دروست دەکات. مەترسە لە برساندا نامریو تێرو پڕی لێ دەخۆی. دەبینی سمۆلینایەکی وا بە تامو لەزەت لێبنێم کە بنی مەنجەڵەکەشی پێوە بلێسیتەوە».

بۆ سبەینێ بەیانی دایکم پێش ئەوەی بڕوات، بەشی دوو ڕۆژ نانی بۆ دانایین، لە گەڵ هەندێ مورەببای بە لەزەتدا تاوەکو لە گەڵ چاکەماندا بیخۆین. هەروەها شوێنی ئەو زەخیرەو شمەکانەی پێ وتین کە تێیدا دانرابوون و چۆنێتی ئامادە کردنی شۆرباو سمۆلیناشی بۆ ڕوون کردینەوە. ئێمە گوێمان بۆ تەواوی ئەو ئامۆژگارییانە ڕایەڵ کرد، بەلام من لە پاشاندا هیچ شتێکم لە یاد نەما. لە دڵی خۆمدا دەمووت بۆچی خۆم سەغڵەت بکەم خۆ میشکا دەزانێ دروستی بکات، ئەی وانییە ؟

پاشان دایکم لێیدا ڕۆیشت بۆ شار، من و میشکاش بڕیارماندا بچین بۆ ڕاوە ماسی لە گوێی ڕووبارەکە. کەرەسەو تفاقی خۆمان سازداو هەندێ کرممان لە زەوی دەرهێنا.

بەلام من وتم: «ئا تۆ کەمێك ڕاوەستە، باشە کێ چێشتی نیوەڕۆمان بۆ لێنێ ئەگەر خۆمان بچین بۆ ڕاوەماسی ؟»

میشکا وتی: «باشە بۆچی چێشت لێبنێین ! شتێکی ئەوەندە گرنگ نییە، نیوەڕۆ گشت نانەکە دەخۆین، پاشانیش سمۆلیناکە بۆ شێوی ئێوارەمان لێدەنێین، سمۆلینا پێویستی بە نان و پێخۆر نییە».

ئەوجا نانەکەمان هێناو مورەبباکەمان خستە سەری و بۆی دەرچووین بۆ ڕووبارەکە. لە پێشدا دەستمان کرد بە مەلە کردن ئەمجار هاتینە دەرەوەو لە سەر

لەکە پاڵ کەوتین‌و خۆمان دایە خۆرەتاو ولە پاش ئەوەش شانمان لە نان‌و مورەباکەمان توند کردو هەموومان خوارد. دوای ئەوە دەستمان کرد بە ڕاوەماسی. ماسییەکان خۆیان بە دەستەوە نەدەداو ئەوەی کە بۆمان کرا بیگرین تەنیا دە دانەی بچووك بوون. بەم جۆرە ڕۆژێکی تەواومان لەوێ بردە سەرو دەمەو ئێوارە بە برسێتی‌یەکی هێجگار زۆرەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵ !

وتم: «چاکە، میشکا تۆ شارەزاو پسپۆڕی، ئێستا چی لێ بنێین ؟ من تەنیا ئەوەم دەوێ خێرا شتێك ئامادەکەین، چونکە لاکەی دڵم دێت لە برسانا». میشکا وتی: «با سمۆلینا لێ‌بنێین، چونکە لە هەموو شتێك ئاسانترە».

- «ئێ باشە با سمۆلینا بێت».

ئەوجا هەستاین کوانوومان ڕێکخست‌و ئاگرمان کردەوەو میشکا هەندێ سمۆلینای خستە نێو مەنجەڵەکەوە.

- «زۆری تێکە، میشکا، خۆ من خەریکم لە برسانا دەمرم».

میشکاش پیرە مەنجەڵی پڕ کرد لە سمۆلیناو ئەوجا هەندێ ئاوی تێکرد. لێم پرسی: «خۆ ئاوی زۆرت تێ نەکردووە ؟ ئاگات لێ بێ چونکە هەموی دەڕژێ بە قەراخ‌و بیجاخدا».

- زۆر ڕاستە دایکم هەمیشە وا دەکات. تۆ چاوت لە ئاگرەکەوە بێت منیش خەریکی لێنانی دەبم. هیچ خۆت شپرزەو نیگەران مەکە».

بەم جۆرە من ڕۆیشتمە لای ئاگرەکەوەو پەیتا پەیتا دارو چیلکەم دەخستە سەری‌و، لەولاشەوە میشکا سمۆلیناکەی دەکولاند. ڕاستێکەی ئەو هیچی نەدەکرد تەنیا ئەوە نەبێ کە بە لای مەنجەڵەکەوە دانیشتبوو.

ئەوەندەی پێ نەچوو تاریك داهات‌و ئێمەش چراکەمان داگیرساندو بە دیار سمۆلیناکەوە دانیشتین تاوەکو بکوڵێ. لە پڕ تەماشام کرد سەرقاپی مەنجەڵەکە بەرز بوەوەو هەندێ شتی لە ژێر هاتە دەرەوە.

پرسیم: «میشکا، ئەوە چییە ؟ ئەوە بۆچی سمۆلیناکە ڕادەکاتە دەرەوە ؟»

- «باشە ئەوە بۆ کوێ دەچێ ؟!»

- خوا خۆی دەزانێ بۆ کوێ دەچێ، بەڵام خۆ لە مەنجەڵەکە دێتە دەرەوە !»

میشکا پەلاماری کەوچکێکی داو کەوتە گێڕانەوەی سمۆلیناکە بۆ نێو مەنجەڵەکە. ئەو هەر تێی دەئاخنی‌و دەیپەستانەوە لە نێو مەنجەڵەکەدا، بەڵام پیرە سمۆلینا پەیتا پەیتا هەر هەڵدەئاوساو لە مەنجەڵەکە بەرز دەبووەو دەڕژا بە لێوارەکانیدا.

میشکا وتی: «من تێناگەم، چۆن ئەم فیلەی دۆزیوەتەوە وا سەرکەوێتە سەرەوە. لەوانەیە بە تەواوی کولابێت !».

منیش کەوچکێکم هەلگرتو کەوتمە هەولدان لە گەلیدا، بەلام بێ سوود بوو. وتم: «میشکا ئەوە ئاوەکە بۆ کوێ چووە ؟ خۆ بە تەواوی ووشکە».

میشکا لە وەلامدا وتی: «من چووزانم ! خۆ من ئاوی زۆرم تێوەردا. ڕەنگە مەنجەلەکە کونی تێدا بێت».

ئەوجا بە چاکی تەماشای چواردەورو بنی مەنجەلەکەمان کرد، بەلام هیچ کونێك لە ئارادا نەبوو.

میشکا وتی: «ڕێی تێدەچێ بووبێ بە هەلمو ڕۆیشتبێت، دەبێ دیسانەوە ئاوی دیکەی تێ بکەینەوە».

ئەمجار هەندێ سمولینای لە مەنجەلەکە دەرهێناو کردیە قاپێکەوە تاوەکو ڕێگا بۆ ئاوەکە بکاتەوە. ئەوجا دووبارە خستمانەوە سەر کوانووەکە بۆ ئەوەی پتر بکولێ. ئاگرەکەمان لە ژێریدا خۆش کردو کولاندمان کولاندمان. لە پڕ تەماشامان کرد دیسانەوە سمولیناکە هەلچووو ڕژا بە لێواری مەنجەلەکەدا.

میشکا وتی: «هەی بۆگەنی بەدفەڕ ئەوە تۆ بۆ کوێ دەچی ؟».

ئەوجا هەلەتی دایە کەوچکێكو هەندێ سمولینای پێ دەرهێنایە دەرەوەو کردیە قاپێکەوەو گۆزەیەکی دیکە ئاوی تێوەدایەوە.

- «تەماشاکە تۆ وا دەزانی زۆر زۆرمان ئاو تێکردووە، بەلام هێشتا دەبێ هەندێکی دیکەشی ئاو تێوەردەین».

درێژەمان بە کولاندنی سمولینا داو هەرگیز باوەڕمان نەدەکرد جارێکی دیکە هەلبچێتەوە، بەلام ئەم جارەشیان لە جاران خراپتر هەلچوو.

وتم: «ڕەنگە تۆ هێجگار زۆر سمولینات تێکردبێت، ئەوەتا هەلدەئاوسێتو لە مەنجەلەکەدا جێگەی نابێتەوە».

میشکا لە وەلامدا وتی: «بەلێ وایە، بەلام وابزانم من زۆرم زیاد تێنەکردوە. بێقەزا بی هەمووی خەتای تۆ بوو ئەوەندەت وت زۆی تێکە برسیمە !».

- «ئەی من دەزانم چەندی تێدەکرێ ؟ تۆ خۆت وتت من دەزانم چۆن چۆنی لێدەنرێ !».

- «چاکە، وا من لێمناوە، بەس تەنیا تۆ خۆتی تێ هەلەقورتێنە».

- ئمم، کە تۆ وا هەست دەکەی ئەوە من لاچووم».

ئەوجا من چوومە ئەولاوەو میشکاش سەرقالی کولاندن بوو، یان ڕاستتر بلێین خەریکی کولاندن نەبوو بەلکو هەر ئەوە بوو کە پەیتا پەیتا سمولینای زیادەی دەردەهێناو دەیکردە قاپو دەورییەکانەوە کە بە هەموو لایەکی مێزەکەدا پەرتو

بڵاو بووبوونەوە دەتوت چێشتخانەیە. هەموو جارێکیش میشکا چەندی دەردەهێنا ئەوەندەی ئاو لە مەنجەڵەکە وەردەدا.

من نەمتوانی لەوە زیاتر خۆم ڕاگرمو وتم: «تۆ دەبێ شتێکت بە هەڵە کردبێت. کار بەم شێوەیە بڕوات دەبێ ئەمشەو تا بەیانی خەریکی کوڵاندنی بین».

- «ئەی تۆ نازانی کە لە باشترین چێشتخانەدا هەمیشە بە شەو دەست دەکەنە چێشت لێنانو بەم جۆرە بە چاکیو ڕێکو پێکی ئامادە دەبێت بۆ ڕۆژی ئایندە».

- «ئەمە لە چێشتخانەدا وایە. ئەوان هیچ پەلەیان نییەو شتی زۆریان لە بەردەستدایە بیخۆن».

- «ئەی باشە ئێمە پەلەمان چییە ؟»

- «ئێمە دەبێ شێوی ئێوارەمان بکەینو بنوین، تەماشاکە وا خەریکە نیوە شەو دادێت !»

- ئێی چاکە دەتوانین ڕاکشێین».

ئەوجا میشکا گۆزەیەکی دیکە ئاوی وەردایە مەنجەڵەکەوە. لە ناکاو بۆم دەرکەوت مەسەلە چییە.

وتم: «دەزانی مەسەلە چییە ؟ هەموو ئەم ماوەیە تۆ ئاوی ساردت تێکردوە ئیدی چۆن دەکوڵێ ؟».

- باشە تۆ چۆن چۆنی بیر دەکەیتەوە، ئەی چۆن بە بێ ئاو دەکوڵێت ؟»

- با نیوەی سمۆڵیناکە لە مەنجەڵەکە دەربێنینو ئەمجارە یەکسەر پڕی بکەین لە ئاوو لێی گەڕێین با بۆ خۆی بکوڵێت».

ئەوجا هەستام مەنجەڵەکەم لە میشکا وەرگرتو نیوەی سمۆڵیناکەم لێ بەتاڵ کرد. وتم: «ئێستا پڕی بکە لە ئاو».

میشکا گۆزەکەی هەڵگرتو چوو بۆ لای دۆلکەکەوە تاوەکە هەندێ ئاو بێنێ. لەوێدا بە سەرسوڕمانەوە وتی: «هیچ ئاو نەماوە، هەموومان کار کردووە.» منیش وتم: «باشە ئێستا چی بکەین ؟ دەرەوە تاریکو نووتەکە، چۆن بڕۆین بۆ ئاو، ئێمە هەرگیز بیرەکە نادۆزینەوە».

میشکا هەڵیدایەو وتی: «قسەی هیچ وپوچ مەکە. من ئێستا دەڕۆمو چارەسەرێک دەدۆزمەوە». پاشان شقارتەکەی هەڵگرتو پەتێکی بەستە دۆلکەکەوەو دەرچووە دەرەوە بۆ لای بیرەکە. ماوەیەکی کەمی پێ چوو وگەڕایەوە.

لێم پرسی: «کوا ئاوەکە ؟» - «ئاوەکە لەوێیە، لە بیرەکەدایە».

- من دەزانم ئاو لە بیرەکەدایە من دەڵێم دۆلکەی ئاوەکە لە کوێیە ؟» وتی: «دۆلکەی ئاوەکەش لە بیرەکەدایە دیسان».

- «ئەمە تۆ چی دەڵێی، لە بیرەکەدایە ؟!» - «بەڵێ لە بیرەکەدایە».
-تۆ خستتە ناویەوە ؟» - «بەڵێ».
- «هەی دەستت بشکێ، خاوو خلیچك ! تۆ دەتەوێ چیمان پێ بکەی، دەتەوێ لە برساندا بمانکوژی. باشە ئێستا ئێمە ئاو بە چی هەڵگوزین ؟»
- «دەتوانین بە کترێکە هەڵیگۆزین».
چووم کتری‌یەکەم هێناو وتم: «ئادەی پەتەکەم بدەرێ».
- «من پەتم لانییە».- «ئەی کەوابوو لە کوێیە ؟»
-«لەوێیە» - «ئەوێ لە کوێیە ؟» - «بـ ... بیرەکە، لە بیرەکەدایە».
- واتە تۆ پەتەکـەت لە گەڵ دۆلکـەدا تێخستووە ؟» - «ب ... بـەڵێ» پاشـان دەستمان کرد بە گەڕان بە دوای پەتێکی دیکەداو لەهیچ شوێنێك پەت بە دەست نەکەوت.

میشکا وتی: «قەیناکە، من دەڕۆم پەتێك لە دەراوسێکەمان دەخوازم». وتم: «دیارە تۆ شێتی، سەیری کاتژمێرەکە بکە. هاوسێکان دەمێکە نوستوون».
لە دواییدا هەردوکمان کەوتینە داوی تینوێتی‌یەوە. ئەوەندەمان تینوو بوو رۆبلێکمان دەدا بە گۆزەیەك ئاو ئەگەر دسکەوتایە.
میشکـا وتی: «هەمیشـە ئاوهـایە، کـە ئاو دەست نـەکەوێ هـەست بە تینوێتییەکی زۆر دەکەی. هەر لە بەر ئەمـەشە کـە خەڵکی بـەردەوام حەز لە ئاوخواردنەوە دەکەن کاتێ کە لە بیاباندا بن، چونکە لەوێدا بە هیچ جۆرێك ئاو نییە».

- «بەس پەندو دەرز دابدە، برۆ بە دوای پەتێکدا بگەڕێ».
- «جا من پەت لە کوێ بێنم ؟ گشت شوێنێکم پشکنی دەستم نەکەوت. ئەها زانیم، با تاڵە داوی ڕاوە ماسییەکە لە کترییەکە ببەستین».
- «باشە ئەو تاڵە داوە ڕاگیری دەکات ؟».
- «بۆچی لەوانەیە ڕاگیری بکات». - «باشە گریمان ڕاگیری نەکرد ؟»
-«ئێ کە ڕاگیری نەکرد... ئەوە دەبچڕێت».
- «من ئەوە دەزانم بەبێ ئەوەی تۆ پێم بڵێی».
پاشان هـەڵساین تـاڵە داوی ڕاوە ماسییـەکەمـان کردەوەو لە دەسکی کترییەکەمان بەست و ڕۆیشتین بۆ لای بیرەکە. من کترێکەم شۆڕ کردەوە و پڕ بوو لە ئاو. تاڵە داوەکە وەکو ژێی کەمانچە توند بووو دەتوت ها ئێستا ها تۆزێکی دیکە دەبچڕێت.

ئەوجا هێواش هێواش لە سەر خۆ دەستم کردە هەڵکێشانی. بە تەواوی لە ئاوەکە هێنامە دەرەوەو لە ناکاو وشلپەی ئاوەکە هات و ئیدی کتری دیار نەماو ون بوو.

میشکا وتی: «ئەوە چی بوو نەهاتە سەرەوە ؟»

وتم: «بێگومان نەگەیشتە سەرەوە، باشە ئێستا چۆن ئاومان دەسکەوێ ؟»

میشکا پێشنیاری کردو وتی: «بابە سەماوەرەکە ئاو هەڵگۆزین».

- نەخێر بەم شێوەیە دەبێ ڕێك و ڕاست سەماوەرە کە فڕێدەنیە نێو بیرەکەوەو بەمەش کاتی خۆمان بە فیڕۆ دەدەین. ئاخر پەتشمان نییە، دەزانی ؟».

- «باشە با بە مەنجەڵێك هەڵیگۆزین».

- «برام، ئەمە ماڵۆچکەی هاوینەمانە خۆ دوکانی مەنجەڵ نییە».

- ئەی کەواتە با گۆزەکە تاقی بکەینەوە».

ئەوجا گۆزەڵەمان هێناو تاڵە داومـان لە ملەکەیـەوە بەستو بـەم جۆرە گۆزەلەیەك ئاومان هەڵگۆستو بەوپەڕی پەرۆشی و تام و کامەوە خواردمانـەوە.

میشکا وتی: «هەمیشە ئاو هایە. کاتێ تینووت بێ وا بیر دەکەیتەوە کە دەریایەکی تـەواو دەخۆیتـەوە، بەلاّم کـە دەست دەکەی بـە ئاو خـواردنەوە پـەرداخێك دەخـۆیتەوەو ئیـدی لەوە زیاتـرت ناوێ. خـەڵکی بە شێـوەیـەکی سـروشتی چاوچنۆکن».

- «لە بری ئەوەی قسەی خراپ بە خەڵکی بڵێی چاکتر وایە بچیت مەنجـەڵی سمۆلیناکە بێنی بۆ ئێرە، بەم جۆرە دەتوانین ڕاستەو خۆ ئاوەکەی تێی بکەین و، بیست جار بە گۆزەکەوە ڕانەکەینە ژوورەوە».

میشکا مەنجەڵەکەی هێناو لە لێواری بیرەکەدا داینا. من سەرنجم نەدا، قوڵێکم لێداو وەختە بوو بیخەمە نێو بیرەکەوە.

بە میشکام وت: «هەمی جاشوولکەی بێ ئەقڵ ! ئەوە بۆچی مەنجەڵەکەت ڕاستەو خۆ لە ژێر ئانیشکی مندا داناوە ؟ هەڵیگرەو سەرقاپەکەی بنێرەوەو لە لێواری بیرەکە لاییە، خەریك بوو سمۆلیناکە بڕژێتە نێو بیرەکەوە».

پاشان گەڕاینەوە بۆ ژوورەوە. سمۆلیناکەمان سارد ببـوەو ئاگـری نێو کوانووەکە گوژابووە. سەرلەنوێ دەستمان کردەوە بە هەڵگیرساندنی ئاگرەکەو جارێکی دیکە کەوتینەوە کولاندنی سمۆلیناکە. لە دواییدا هاتە کوڵ و خەست بووە وکەوتە قوڵپە قوڵپ و کەف کردن.

میشکا وتی: «ئەهای چ سمۆلینایەکە، بەڕاستی چاکە !»

منیش پـڕ کەوچکێکم لـێ دەرهێنـاو وتامم کـرد: «ئوفف ! بـەمە دەڵێی سمۆلینا ! خۆ تاڵە، هیچ خوێی تێدا نییەو بووە بە شتێکی بۆگەن و پیس».

میشکاش ویستی تاقی بکاتەوە بەلام دەسبەجێ تفاندییەوەو وتی: «نە، نە، بیشمرم ئەمە ناخۆم».

منیش وتم: «ئەگەر تۆئەمەت خوارد وای دادەنێم کە مردووی».

- ئەی باشە ئێستا چی بکەین ؟» - «چووزانم».

ئەمجار میشکا وتی: «ئای کە ئێمە چەند گەوج و نەفامین ! ماسیمان هەیە !» وتم: «وەختمان نییە خۆمان ئێستا بە ماسییەوە خەریك کەین، وا خەریکە رۆژ دەبێتەوە».

- «ئاخر ئێمە خۆ نایان کوڵێنین، سووریان دەکەینەوە لە رۆندا. ئەمەش بە خێرایی دەکرێ و هیچ وەخت ناکوژێ.»

وتم: «زۆر چاکە ئەگەر دەسی وبرد ئامادە بکرێ. بەلام ئەگەر وەکو سمۆلیناکەی لێ بەسەر بێت، چاکتر وایە هەر دەستی بۆ نەبەین».

- «دەقیقەیەك پشوو بگرەو بە چاوی خۆت دەیبینی».

ئەوجا میشکا هەستا ماسییەکانی پاك کردو خستنیە تاوەکەوە. تاوەکە داخ بووو ماسییەکانی پێوە لکان. میشکا بە چەقۆیەك کەوتە کراندنیان و لە تاوەکەی دەرکردن پاش ئەوەی پێست و گۆشتێکی زۆری پێوە بەجێهێشت.

وتم: «وەك ئافەرین ! چۆن ماسی بە بێ رۆن سوور دەکرێتەوە ؟» ئەوجا میشکا شووشەیەك رۆن گوڵەبەرۆژەی هێناو کردیە تاوەکەوە، پاشان تاوەی لە سەر ئاگر راگرت و رۆنەکە چزەی لێ هەستاو لە ناکاو تاوەکە گڕی گرت و بڵێسەی ئاگری لێ بەرز بوەوە. میشکا هەر ئەوەی پێ کرا فڕاندیە دەرەوەو منیش ویستم ئاوی بە سەردا بکەم، بەلام تەیا یەك دڵۆپ ئاو لە ماڵدا نەبوو. بەم جۆرە هەر کڵپەی دەهات تاوەکو هەموو رۆنەکە سووتا. ژوورەکەش پڕ بوو لە دووکەڵ و بۆکڕووزو ئەوەی لە ماسییەکان مابۆوە هەندێ تۆپەڵ و پارچەی سووتاو بوون. میشکا وتی: «باشە ئێستا ئێمە چی بکەین چی سوور بکەینەوە ؟».

وتم: «نەخێر، هیچ شتێك مەکە، وا دیارە زۆر دڵت خۆشە. تۆ هەر بەوەوە نەوەستای کە خواردنەکانت خەسار کرد، بەڵکو خەریك بووی ئاگرێکیش بخەیتەوەو خانوەکەش بە بۆنەی تۆوە بسووتێ. ئا ئەمە بوو کارو کردەوەکانت !».

- «ئەکەواتە چی بکەین ؟ من هێجگار برسیمە !»

هەندێ سمۆلینای ووشکمان لە پاکەتە دەرهێناو ویستمان بیخۆین بەلام تامێکی زۆر ناخۆشی بووو نەدەخورا. ئەمجار ویستمان پیازی کاڵ بخۆین ئەویش توون بووو نەدەخورا. هەولمان دا کەرەی بێ نان بخۆین بەلام قێزمان لێ دەهاتەوە. پاشان کووپەی مورەباکەمان دۆزییەوەو کەوتینە لیستنەوەی. ئەمجار رۆیشتینە نێو جێگاکانمانەوە تاوەکو بنوین. کات زۆر زۆر درەنگ بوو.

بۆ سبەینێ بەیانی بە برسێتی‌یەکی هێجگار زۆرەوە لە خەو هەستـاین. میشکا دەسبەجێ پاکەتی سمۆلیناکەی دەرهێناو دیسان کەوتەوە لێنانی، منیش بە جارێ ترس و سامم لێ نیشت و وتم: «برای چاك وازی لێ بێنە ! وا من دەچم بۆ لای پوورە ناتاشای دەراوسێمان و داوای لێدەکەم کە هەندێ سمۆلینامان بۆ لێبنێت».

ئەوجا هەردوکمان بە جووتە چووین بۆ لای پوورە ناتاشاو هەموو شتێکمان بۆ گێڕایەوەو بەڵێنمان دایە کە هەردوکان باخی سەوزەکەی بۆ بژار بکەین ئەگەر هاتو یارمەتی داین لە لێنانی سمۆلینادا.

پوورە ناتاشا زۆی بەزەیی پێماندا هاتەوە: شیری بۆ تێکردین وهـەندێ حەڵوای کەلەرمی داینێ و داینایین بۆ ئەوەی بەرچایی بەیانی بکەین. ئێمـە بە ڕوشەوە پەلاماری خواردنەکەمان دا بە ڕادەیەك کە ڤوڤکای کوڕی پوورە ناتاشا سەرسام بوو بوو لەوەی کە دەیبینی ئێمە وا ئەوەندە برسیمانە.

پاش ئەوەی کە تێرمان خوارد، پەتێکمان لە پوورە ناتاشا خواست و چووین بۆ دەرهێنانی دۆلکەو کترییەکە لە بیرەکەدا. ماوەیەکی زۆر خۆمان پێوە خەریك کرد بەلام بێ کەڵك بوو، ئەگەر زیرەکی وبلیمەتی میشکا نەبوایە کە ناڵە ئەسپێکی بەستە پەتەکەوە، هەرگیز نەمان دەتوانی لە بیرەکە دەریان بێنین.

پاشان من و میشکاو ڤوڤکـا ڕۆیشتین بـۆ بژارکـردنی باخـەکە. بـە دەم ئیشکردنەوە میشکا دەیوت: «بژار کردن هیچ نییە، هیچ شتێك لە بژارکروندا گران نییە و زۆر ئاسانترە لە لێنانی سمۆلینا !».


سەرچاوە

سپوتنیك

SPUTNIK

NO. 6 June 1973

P.168 — 173

Mishka and the Semolina

Astory by Nikolai Nosov

# مەيرۆ لدهوكێ ئاگنجى بۆ

**سگڤان عبدالحكيم**

ژ بەلافكرنا ئەميندارىيا گشتى يا رەوشەنبيرى و لاوان لدەڤەرا كوردستانێ نڤشتوكا سەيدايێ مەزن محمد أمين بۆز ئەرسلان دەركەڤت بناڤێ مەيرۆ سەيدا عبدالكريم فندى ژتيپێدلاتينى وەرگێرايە ژ دەهـ چيرۆكا پێك هاتيە و(92) بەرپەرێت ناڤنجى و رەنگ و وينێ نڤشتوكێ هەر ژ نڤشتوكا لاتينى وەرگرتى يە.

بەرى بێنە شروڤەكرنا ڤا چيرۆكا من دڤێت بێژم پشتى من ئەڤ دەهـ چيروكە خاندين هندەك خالێت گەش تێدا خويا دبن.

1 ـ راستيا ژين و ژيارا مللەتێ مە لگوندو باژێراو هەژاريا تێدا دژين.

2 ـ ئەو هزرێن دهاتينە گوتن و بەلاڤكرن كو بادينا زمانێ هەكارى و بوتيا تێناگەهن درەوو خەلەت دەركەفت چنكو ئەز باوەرناكەم كو ئێك ژ دهوكێ يان ئامێدێ بمينت ئاسێ بخاندنا چيروكێت سەيدايێ مەزن بۆز ئەرسلان.

3 ـ سەیدایێ بۆز ئەرسلان وەك ئەم دنیاسین رۆژنامەنڤیسەك شەهرەزاو خام خورتبوژ بەر هندێ بدارشتنا چیرۆکا وەك سەلیقا توریێ رۆژنامەڤانی هات پترژ توریێ هشك و زوها.
4 ـ زمانێ کوردی بهێزە ژ لایێ ئیدیەمێت بکار ئیناییین وەك، هەستە، ژمە چێتران.
5 ـ چیرۆك گوتن هندە جارا وەل مەدکەت ئەم هزر بکەین کونێزیك فولکلوری‌یە پترژ خام و هزرێت سەیدایێ مەزن بۆز ئەرسلان.
6 ـ سەیدایێ نڤیسەڤان عبدالکریم فندی خو وەستاندیەو بدلوڤانی پیروزباهی ژێرا نان وسە.

چیروکەکە سیدار وەك زارۆکەك کورد یاریا دگەل هەڤالْ و هوگرا دکەت برسی دبیت دزڤریتە مالێ دا نانەکێ بخۆت لێ دەیکا وی دبێژتێ مە خارنا روینی نینە دبێژتێ کەرەك نانی دایێ ڤەگەریا دەڤ هەڤالێت خۆ بریکێڤە هەلنگفت و نان و خیارێ وی ژدەستا فری سەیەك هات خار و هەڤالێت وی ژ دیرڤە کرە کەنی و سیدار ما دکوڤانادا هەلبەت ئەڤ خێزانی‌یە دناڤ کوردادا مشەیە لێ جوانیا ڤێ چیروکێ ددێك و پێکا پەیڤێت کارهاتین و زارۆکێ کورد ژ ینا وی‌یا چاوا بوو.
دابیینە پەستەکا چاوا هندە زارۆکا بێی دەیی‌وبابا تووتن دکێشان و رۆژەك ژ رۆژان قەستا هەڤالەك خو کرن لگوندەك نێزیك و لوێری تیتن کرین و ڤیان ستەوبەرا (چەرخ) بکرن بەرێ ئێك ژ وانا گوتی پێ نەڤێت چنکومەیێ هەی‌ولزڤرینێ دوو ئێلچی دیتن و پشتی ئەوزارۆك سەحکری ئەوچەرخ ژێ ستاندن و لگەل خۆبرن دادگەهێ بەلێ برێڤە زارۆك و ئێلچی پێك هاتن کوچەرخ بووان بێت و ئەوزارۆکا بەردەن و هەروەسا چێ‌بووژی لڤێرە تێگەهشتن و زۆرداری ئاشکرا دبیت کا چاوا دژێت ئێکن.
چیرۆکا کومێ تفنك برایێ باران یێ مەزن کولاڤەکێ بۆدکریت لێ سیخورەك یێ کوناڤێ وی تۆلێ کوچکان زۆرداریێ لێ دکەت و ناهێلیت خۆشییێ بخۆببینیت.
براستی ئیدیەما ژمە چێتران (الجن) گەلەك بەرەکەفتی‌یەو سەیدایێ مەزن بۆز ئەرسەلانی دڤیا بشێتە مە ئاشوپەو درەو گەلەك هەنە دناڤ ژینا کوردەواریدا نەمازە دەمێ زەلخێ جلا لنهالێ دشوت و ساڤایێ وەرپێجایی دانای بن سیبەرا داراو ساڤا نەساخ دبیت و زەلخی هەوارا خو دگەهینتە خەجێ پیرەژنا ب کەرامەتا لگوندی بەلێ مخابن ساڤا دمریت و جانیا زەلخێ دمینت.

**تیتن چاوا دبیتە کا: ـ**

---

ئەو کاروانیێت کورد نکارن بازرگانیا ژ خورا بکەن ژ بەر ئێلچیاو جارەکێ دکەڤنە

تەنگاڤیەکێ لێ کاروانی دەردکەڤن زاناو شەهرەزاتر ژ ئێلچیا وەختێ بارێ خۆدگوڕن ورو ڕەشی ل ئیلچییا دمینیت.

**سیتل:** ـ رندێ مر (شێرۆ دەستێ خدە دا زکێ ژنا خوە) بشکوریوگوت «تۆدێ ب ڤی هالی چاوا بچی بەرئاڤێ، رندی!».

رندێ بشری: «مائەز هندك ب ڤی هالی چومە، نایێ بیراتە!..».

دەستێ خوە ب ئالی زارۆکان ڤە راکرو پەیڤا خوە ئاژۆت:

«من ئەڤ هەمی ب ڤی هالی نە ئاینن ما!..».

ڕەندێ زك پڕەوشول کەرە هەلبەت مرن دگەل ژڤان بوژخویا زەرۆچێلا خوبەرزە دکرو هندی لێ دگەرت دابیینت بەلێ نەدیت ئینا قەستا مەلایێ کرمەلایێ گوندی دا دەڤێ گورگی گرێ دەت پشتی مەلایی بوخاندی دیت چێلا وێ ب دەڤی گورگی هاتیە خازن چەند وێنەك جوانە بۆ ژ یارا کوردەواری یا تژی باوەرو دل پاقژی بێگونەهـ ژ خو فەرهۆ بئێشا زراف (مرض السل) هەرچەند خەلکێ گوندی نەدزانین کا ئەڤ چ نەساخیە دیسا دادا خۆدگەهینە مەلایی گوندی بەلێ حەیف بازبەندا مەلایی نەشیا فەرهۆ ژمرنێ قۆرتال کەت.

**زاڤایێ دەهسالی:** ـ هەرچەندە ئەڤ ڕەوشتە دناڤ کورددادا هەیە دەمێ بیکا مازن بژیێ خۆڤە بۆ گەنجەکێ بچیك تینە دمالێڤە یا مارکرودێ لهیڤیا کورکی بن هەتا بالغ دبیت، بەلێ ڤێ زەرێ جەژ لەزگین دکر، لەزگنیژی ژ ئەڤینارا خۆدیر بوهەتا هاتی دەستێ کەچێ گرت و ڕەڤاند هۆسا ئەڤینی چارا درست بوگرفتاربێت کوجڤاکێ دادنێت، ژخو«مەیرۆ» کانیا مەستۆبوهاریکار وشڤان بۆژ بێ خەمەتا ترارەك ئاڤێ مەیرۆدمریت برێکا کانیێدا مارەك دگەزیت ـ پێڤەددت.

● گشت چیرۆکید سەیدایی مەزن بۆژ ئەرسەلانی سەرکەتینە چنکۆدبێ سوراڤوسپیاڤن بێ ئاشوپ ودرەون بەلێ بەروڤاژی دیرۆکا قۆناغەك ببەها ژ ژ یارا مللەتێ مە دادرێژ ییت پەیڤێت گەش ودەس خۆش سەیدایێ عبدالکریم فندی بۆ ڤی کارێ پیرۆز خوزی سەد خوزی ئەڤ تورێ مەیێ زێرین ورەنگین وبەنگین هەمی هۆسا مە خاندباو دەرگەهێ وەرگێرانێ و بزاڤا گورینی بتیپێدا لاتینی بۆ عەرەبی بەردەوام بێت.

# پیاچوونەوەیەك بە

# گۆڤاری «كوردستان»دا

# ژمارە (٢) لە ٢١ كانونی یەكەلی ١٩٤٥

☐ ئامادەكردنی: ع. تالەبانی ☐

## پێشەكی یەك:

ئەو شۆڕشەی كە ئەمڕۆ لەكوردستانی ئێراندا سەری هەڵداوەو، هەموو هێزە ئازادیخوازەكانی كورد تیایا لە بۆتەیەكدا - سەرەڕای جیاوازی لە هەندێ بیروڕای نێوانیاندا - كۆبوونەتەوە بۆ بەگژاچوونی رژێمی خوێنرێژو رەگەزپەرستی خومەینی، ئەم شۆڕشە هەر لەخۆیەوە دروست نەبوەو، لە زەمینەیەكی بۆشەوە هەڵنەگیرساوە، بەڵكو پشتی بە تۆمارێكی فیداكارانەو قوربانیدانو، مێژوویەكی پڕ لە ئازایەتیو لەخۆبوردن ئەستورەو، لەوێوە گیانی خۆراگرتنو سووربوون لەسەر وەدی هێنانی سەركەوتنو جێبەجێكردنی ئامانجەكانی گەلی كورد لەكوردستانی ئێراندا وەردەگرێو، ئەم شۆڕشە بۆتە خاوەنی تەقالیدێكی شۆڕشگێڕانەی ئەوتۆ كە لەو بڕوایەدا ین لە ئەنجامدا سەربە رژێمی ئاخوندی رەگەزپەرست دادەنەدێنێو، لەبەردەم خواستەكانی خەڵكی كوردستانی ئێراندا چۆك دادەدا.

بێینەوە سەر باسەكەمان، بەلای ئێمەوە بەشێكی گرنگی ئەو زەمینەیەی كە بزوتنەوەی ئەمڕۆی كوردستانی ئێران پێی خۆی لەسەر قایمكردوە.. زەمینەی بیرو رۆشنبیری ئەو سەردەمەیە، كە لەوە دەچێ دەورێكی چاكی لە هۆشیاركردنەوەی خەڵكەكەدا بینیوە.. لێرەوە بایەخی پیاچوونەوەی رۆژنامەو

گۆڤارەکانی سەردەمەکانی پێشووی بزوتنەوەی گەلی کوردی ئەودیو دەردەکەوێ، بەتایبەتی هی سەردەمی دامەزرانی حزبی دیمکراتی کوردستانی ئێران‌و، پێکەوەنانی کۆماری مەهابادو، لەو بڕوایەشدان ئەم پیاچوونەوەیە جگەلەوەی ڕێ بۆ لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی ڕۆژنامەنووسی‌ی کوردیش پاك دەکاتەوە، لەهەمان کاتدا زۆر لایەنی ڕۆشنبیری‌و کۆمەلایەتی‌و سیاسی ئەو سەردەمەشمان بۆروون دەکاتەوە.

## ژمارە (٢):

لەژمارە (١٠٥)ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ» دا پیاچوونەوەیەکم بەژمارەی یەکەمی گۆڤاری «کوردوستان» دا ـ کە ئەمە شێوەی نووسینی وشەی کوردستانە لە گۆڤارەکەدا ـ بڵاوکردەوە، ئینجا بۆئەوەی ناوەڕۆکی ژمارەکانی تری ئەم گۆڤارە بخرێتە بەردەم هەموو خوێنەران، بەپێ‌ی تواناو تا ئەو جێگەی بڕبکەین بەژمارەکانی تریشدا دەچینەوەو بڵاویان دەکەینەوە.

ژمارە (٢)ی ئەم گوڤارە لە ٢١/ی دیسامبەری (کانونی یەکەم)ی ١٩٤٥ دەرچوە، واتە پاش دەرچوونی ژمارەی یەکەم بەپازدە ڕۆژ، لەسەر بەرگی یەکەم ناوەڕۆکی ژمارەکە بڵاوکراوەتەوە هەروەها تیادا ڕاگەیاندراوە کە لە (مهاباد چاپخانەی کوردوستان)[1] لە چاپ دراوە، لەدیوی ناوەوەی بەرگی یەکەم‌و بەرگی دوەم هەواڵی پێکهاتنی دەسەلاتداریتی کۆمار لەشاری نەغەدە بڵاوکراوەتەوە.

لەلاپەڕەی دوەمیشدا، تا ناوەڕاستی لاپەڕەی شەشەم بەزمانی فارسی وتارێك دەربارەی زمان‌و ئەدەبیاتی کوردی بە پێنوسی (س.م حمیدی) ناوێك بڵاوکراوەتەوە، نووسەرەکە دەیەوێ ئەو ڕاستی‌یە بسەلمێنێ کە زمانی کوردی هەرچەندە جۆرە خزمایەتیەکی لەگەڵ زمانی فارسی کۆندا هەیە، بەلام زمانێکی جیاوازەو، هی میللەتێکی جیاوازەو، کورد فارس نیە، بەڵکو کوردیش هەموو مەرجەکانی نەتەوەی تیا هەیە، هەروەها نووسەر ئەوەشی ڕاگەیاندوە کە کوردیش خاوەنی ئەدەبیاتی خۆیەتی‌و باسی ئەدەبی کوردی‌و شۆڕەسوارانی

دەكا هەر لەسەرەتاوە... (علی تەرموكی)و (بابا طاهری همدانی)و (علی حریری)و (مەلای جزیری)و (فقی تایروان) ـ فەقێتەیران ـ و (احمدی خانی)و (شریف خانی جولەمەرگی)و (شاه پرتو حكاری)و (احمد رامز بيك كورديزادە)و (مصباح ساوجبلاغي)و (مصطفیٰ بیگ كوردی)و (ملاخضر نالی)و (حاجی قادر كۆیی)و (عبدالرحمن بیگ سالم)و (شیخ عبدالرحیم مولی اورامی)و (مولان خالد كوردی شهرزوری)و (شیخ رضا طالبانی)و (محمد افندی)و (حمە اغای دربند فقرە)و (حسن كنوش)و (صالح افندی آهی)و (احمد حمدي بیگ)و (طاهر بیگ)و (احمد بیگ جاف)و (امین فیض بیگ)و (خستە)و (سلیمان افندی یمنی)و (ملا صالح حریق)و (عبدالله حسن)و (ملا محمد خاكی)و (ملا مصطفیٰ بیسارانی)و (ولی دیوانە)و (احمد كور)و (امین بیگ دزەیی)و (وفائی)و (ملا مصطفیٰ بیاری)و (حسن هومر)و (ملا محمد كوماسی)و (ملا محمد دربند)و (ملا قادر شیخ وسانی)و (ملا رحیم ومكری)و (كاك امین مكری)و (كاك مصطفیٰ ایرانی)و (ملا محمد كوئی)و (ابو الحسن سیف قاضی)و (ملا معروف كوكی)و (ملك الكلام)و (بردەشانی)و (پیرەمیرد)و (سالار سعید حیدری)و (شپرزە)و (خالەمین)و (هەتاو) (شپرزە)و (قانەو (ملا كریم زاری)و (غرقی شعری)و (فایق بێكەس)و (سلام)و (گۆران)و دوو شاعیری تریش.

لەنیوەی لاپەڕەی شەشەمەوە پارچە شیعرێكی (خالد حسامی ـ شیواو ـ) بڵاوكراوەتەوە بە سەردێڕی (شیوەنم بو وەطەنە) تیایا دەڵێ:

(گیانە من كارمكراوە بویە هەر هاوارمە
بو طبیبی دەردەكەم نایە چە جیی تكرارمە
دل لەدەستم چوتە دەر یاران چلونی بینمەوە
دایم آخر آهی سردو جەرگی آور بارمە
ژینی من تازە محالە والەچاوم خوینی گەش
تك تك دەرژی كەسەرچاوە دلە خوین بارمە
خوم بەقوربانی وەطەن كردو فریم دا زیندەگیم
وەرنە سەرشینم رەفیقان هەركەسی غمخوارمە
هتد..)

ئەم شیعرە ناسكە لە(١٥) بەیت پێك هاتوە..

لە لاپەڕەی حەوتەمدا شیعرێكی هێمن بە ناونیشانی (بژی دیموكرات)

بڵاوکراوەتەوە، هەروەها لەم لاپەڕەیەو لە لاپەڕەی هەشتەمدا چەند دەنگوباسێك بڵاوکراوەتەوە.. بۆ نموونە:

(دەنگ و باس

**ناریکترین کردەوەی کەسیک ئەوەیە کە لە وولاتیکدا جیگایەك بو پیك هینان و ریکخستنی داواوکیشە هەبی و خەلکی بەخوشی خویان کاران بکەن کە لەدوایدا خوتوشی بەلاو ضرەر بەخەلك بگەیینن. هەروەکو بیستومانە عبداللە بگ اغای یالاوە لەگەل حمزە اغای وەتەمیش مرافعەیکی ملکیان هەبوە عبداللە بگ بو دادخوازی دیتە شاری (مهاباد) کە لە حزبی دیموکرات شکایت بکا مصطفی ی کوری حمزە آغای وەتەمیش دەکەویە دووی و دەیکوژی، چەندە کە کەیان بو پرسینەوەو داخوازی هینایە شاری چلونیەتی ویی لە تحقیقدایە ونتیجەی لەژماری سیدا دیتە بەرچاو)**

تەواو -

لەلاپەڕەی نۆهەمیشدا (ع.خ) ناوێك گفتوگۆیەکی لەنێوان کوڕێك و دایکێکدا لەژێر ناونیشانی (ئەی دایکی نیشتمان) بە زمانێکی زۆر و پاروا بڵاوکردۆتەوە. هەروەها لە لاپەڕەی دەهەم و یازدەهەمدا (م.م.عیشقی) پارچە شیعریکی ناسکی بەناونیشانی (دەورە دەورەی هونەرو کار دەبی) ئەمە چەند بەیتێکیەتی:

(کیژیکی چاردە سالی لیوال
هاتەوە روژی لە مەکتب بو مال
دلی پر بوو لە نم و حزن و خیال
بەغضب هاتەوە مال قەد شمشال
هاتبوە جوش کورەی احساساتی
زور بەهیبت بو قیافەی ماتی)

مانای گشتی ئەم پارچەشیعرە دەربارەی کچێکی قوتابی دەسکورتەو چۆن

هەندێ لەدەستە خوشکە دەوڵەمەندەکانی لەبەر هەژاری‌یەکەی نایدوێنن ولەگەڵ خۆیان بۆ سەیرانی نابەن، لەئەنجامدا. بەڵام دایکی کچە دڵی دەداتەوەو تێی دەگەیەنێ کە:

(تو بە ظاهر کەفقیرو روتی
بەهونەر قیمەتی وەك یاقوتی)

لەنیوەی لاپەڕەی یازدەهەمەوە تا کۆتایی لاپەڕەی سیازدەهەم پارچە هەڵبەستێکی بیگانە کراوەتە کوردی بەناونیشانی (کچێکی دیل) بە پەخشانێکی ناسك پێشکەشی خوێنەران کراوە.

لە لاپەڕەی چواردەهەمدا لەژێر ناونشانی (فرمێسکی هەتیو) دا پارچە هەڵبەستێکی فارسی وەرگێرراوەتە سەر زمانی کوردی هەر بەشیعرو، لەدواییداو تالاپەڕەی شازدەهەم بەشی دوەمی لیکۆڵینەوەی دیموکراسی چیە کە لە ژمارەی یەکەمی گۆڤاری «کوردستان»دا لەچاپ درابوو بڵاوکراوەتەوە.

هەروەها پارچە شیعرێکی تر بەناونیشانی (هەلدەکەم) لەلاپەرەی هەڤدەهەم (کە بەهەڵەی چاپ بوەتە ١٥) و لاپەڕەی هەژدەهەمدا بڵاوکراوەتەوە.

دوا باسیش کۆتایی باسێکی ژمارەی یەکەمی گۆڤارەکەیە کەدەربارەی ژیان و سەرگوزوشتەی ستالین بووە.. لەکۆتایی لاپەڕەی بیستەمدا هەواڵێکی تر بڵاوکراوەتەوە لە شاری مەهابادەوە، دەربارەی یەکەم رۆژی فەرمانڕەوایی پێشەوا قازی محمد.

**چەند سەرنجیك:**

ئەوی پێویستە بوترێ کە قەوارەی ئەم ژمارەیەش هەروەکو ژمارەی یەکەمە وایەو، هەروەها لە ٢٠ لاپەڕە پێك هاتوە..

لەم ژمارەیەدا واهەست دەکرێ کە بایەخ بەبڵاکردنەوەی چەند هەواڵێك دراوە کە پەیوەندیان بەژیانی خەڵکەکەو دەسەڵاتداریتی حزبی دیموکراتەوە هەیە.. هەروەها ئەوەش سەرنج رادەکێشێ کە دەنگوباسەکان بەشێویەکی رۆژنامەنووسی‌ی تارادەیەك پێشکەوتوو دارێژراوەو، شەش هەواڵی تیایە.

دەربارەی راسیی‌کردنی هونەری ژمارەکە، هیچ پێشکەوتنێکی ئەوتۆی پێوە نابیزێ.

ئەوی زۆرگرنگ بیٚ‌و، ئەوەبدۆتە دەستەوە کە کاربەدەستانی گۆڤارەکە لەوباروزروفەدا کە فەرمانڕەوایی کورد لەمەهاباد دەستی پیٚکردوە، پیٚویستیان بەوە هەبوە، کە لەفارسەکان بگەیەنن، کە کورد میللەتیٚکی جیاوازەو خاوەنی ئەدەب‌و مەرجی نەتەوەیی خۆیەتی، بۆیە ئەبیٖنین یەکەم وتاری ئەم ژمارەیە بەفارسی‌و بۆ روونکردنەوەی ئەم مەبەستە تەرخان کراوە، بیٚگومان ئەمە بەلاکردنەوەیەکی راگەیاندنی زیرەکانە دەژمیٚرریٚ.

ئیملا، هەر ئیملای ژمارەی پیٚشوەو زۆر لەئیملای ئیٚستامانەوە دوور نیە، حەوت بەکار نەهیٚنراوەو لەباتی (سەر ـ فتحە) لە زۆر شویٚندا (أ) بەکارهیٚنراوەو لەهەندیٚ جیٚگاشدا پەیڕەوی ئیملای عەرەبی و فارسی کراوە.

زمانی نووسینیش، هەر بەشیٚوەی موکری‌یەو هیچ شیٚوەیەکی تری تیٚدا نیەوە زۆر پاك‌و بیٚگەردو خۆشە.

---

(١) ئەو رستەو شانەی لەنیٚو دوو کەوانە دانراون هەر بەئیملای گۆڤارەکە نووسراون.

■
**کامیل ژیر**
■

بەم گوارە شۆڕەوە، جوانی: نێرگزە جاڕی بەهار
جاران لادێ، ئێستا گوارە مۆدەی پەریزادی شار

بەم گوارە شۆڕەوە سەری ئەلەرزێنێو سەری بەر
خۆی لە تەل داوە، رازاوە، بووکی جەژنی سەری وەر

بەم گوارە شۆڕەوە بەرگی هەمووی هەر پوولەکە ڕێ
ورشەی پوو لەکە تێکەڵی ورشەی ئەگریجەی درێ

بەم گوارە شۆڕەوە لەشی پەرداغ، دەوری چاوی رشتر
بەکلی رەش، برۆ هەر رەش، پرو پەیوەست، هەڵنەگرت

بەم گوارە شۆڕەوە دەست وپێی بەخەنە سوورو نەخش
پانییەرزی پوولەکەچن بە سەر پێوەی پڕ لە ورش

بەم گوارە شۆڕەوە خشڵی داوە لە خۆی بەڵام کەمێ
پاوانەی پێو مێخەکبەندو تاکێ بازن، سەر پەرچەمێ

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: واتایەکی گەلێک ور
گوڵی گەشاوەی بەهارم، کچە کوردم، کچە کور

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من جوانیەکەم هەر لەش نی
مرۆڤ تەنیا بە بەرگەوە وێنەی گوڵێکی گەشنی

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من باوەڕم، من پیرۆ
من پەیکەری کوردایەتیم، چرۆی داستانی نەورۆ

بەم گوارە شۆڕە جوانەوە ئەکشێتەوە لە رەش بینی
بزەی دێتو پێ ئەکەنێ، چاوی پڕە لە گەش بینی

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من ئەوینم بۆ کوڕی کورد
بۆ پێشمەرگە هاوبیرەکەم، لاوی ئازای بە دەستو برد

بەم گوارە شۆڕە جوانەوە ئەڕوا لەسەر نووکی پەنجەی
ئاهەنگێکە، چۆپی نوێیە بزواندنی لەشو لەنجەی

بەم گوارە شۆڕەوە شایی بە شێوەی شەنگی شاکارە
پێشەوای کوڕی هەڵپەرکێ، سەر چۆپی کێشە ناو دارە

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: من وەك جوانم نیازشیم پاك
سەرچاوەی بیرو فەلسەفەم خۆماڵی بەو کردەوەم چاك

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: لە جوانیدا تاکم نیە
من پەروانەم، بۆ رووناکی لە مردنیش باکم نیە

بەم گوارە شۆڕەوە نیگا بە چوار لادا ئەپرژێنێ
دڵی دژ دا ئەخورپێنێ، رەنگی دڵداری ئەرژێنێ

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: هەر چەن لەسەر رووی ئەم ئەرزە
لە سەر خاکێك ئەژیم پێشێل، بێ دروشمەو بەبێ مەرزە

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ لەوەش زیاتر خۆشم دیلم
بەڵام شادم چونکە بە هەست کچە کوردی وریاو ژیرم

بەم گوارە شۆڕەوە ئەڵێ: کە من هەستم هەبێو نەمرێ
رۆژێ ئەبێ داری ئێمەش بەری رەنجو گەنجی بگرێ

م گوارە شۆڕەوە ئەی جوان، ئەی کچەکورد، ئەی شۆخو شەنگ
بە قوربانی بەری پێت بێ هەزار سەری بۆشو دەبەنگ

# سالنامەی سەدەی بیستەم

لەتیف هەڵمەت

(١)

لا فاوێك دێ... لافاوێ تاریك پڕە لە: زام... لە مەرگ... لە نەخۆشی لە
ماری خەم لە كرمی كڕ...
كەس سامۆتكەی ترس‌و بیم فریشكی نەخات! ئەم لا فاوە
سەرچاوەكەی شەختەو زوقمی ناپاكی‌یە دەدا بەسەر شارو دێدا.

بووکە شووشەو شانەو ئەنگوستیلەی زێڕین و کۆشکی زیوین و
هەزار هەزار شتی جوان و ئاڵ و واڵا
لە شەقامە داوەکاندا ڕۆدەکات
کەسی دەستی بۆ نەبات
هەمووی لەغم و بۆمبای پڕ لە ئەسپێی مەرگە!
من نازانم ئادەم کەی لە بەهەشت دەرکرا
بەلام دەزانم کەی کۆلۆمبس ئەمەریکای دۆزی‌یەوەو
کەی هیرۆشیماو ناگازاکی
لە گەرداوی ئەتۆمدا پەڕو باڵیان بوو بە تەم...
دەشزانم لە کەیەوە لووتکەی هەلگورد نیشتمانی
من و هەتاوە..!!!
ئەی مێژوو بۆ زالووی بێ دەنگی
گەرووی ویژدانی قەمتەر کردوویی
دە بە چەند وشەیەك زەوی بهەژێنە...!
ئەی برسی‌یەکان
بۆ بوون بە قاوی بەردە ئەستێی نەیرۆن...؟
ـ ئەوە کێ‌یە زریکە لە دەرگاکانمان هەلدە سێنێ؟
ـ منم... من... هەواڵم پێ‌یە... هەواڵێ دڵ دەکاتە
باخچەی خەونی فێنك...
ـ تۆ کێ‌ی؟
ـ من ئەڵێی!! من... منم... ناونیشانم چیایەکی بەرزە
ناویشم گۆرانی‌یەکی ئاگرینە...
(هەتاوێ گەش
لافاوە تاریکەکە دەکات بە تەمێکی سەرەڕۆ
لافاوە تاریکەکە چرای ناو پەنجەرەی
دڵە شەیداکانی پێ ناخنکێنرێ
دوای لافاوەکە ئەو زەردە خەنەیە
لە باڵە خانەی خەونەکانماندا سەما دەکات
کە لە دووکەڵی سەدەی بیستەمدا
خرابووە قەفەزەوە...!
هێلکەی خەو بشکێنن
ئەمە ئەو هەتاوەیە لە سەر شیشی دەلاقەکان

قەڵەمباز دەدات
کە بەزەردەخەنەی قوربانییەکان دروست کرا
هێلکەی خەو هەپروون هەپروون کەن
خەو کالاسیو گەنە بەڵەش هەڵدێنێو
وشەو ئەوین دەکاتە بە ژەنگو کەڕوو...!)
دووکە لێکی دوور دەیەوێ
مانگی ئاسمانی ئەوینم لووش کات
بۆ ئەوەی وشەکانم لەتاریکاییدا کرم بیانخوات!
دەسا ئەی بارانی شاراوەی
پشتی ئاسمانە چاو شینەکان
دووکەڵ تەفرو توونا کە
دووکەڵ وەکو گردی خوێ رامانە
دووکەڵ بکە بە پارووی بۆشاییەکی برسی!
مانگی ئەوینم لە تەپکەی مەرگ دەرباز کە
با کچە قژ زەردەکانی شارە بچکۆلەکەم
لە بەر پەنجەرەکانیاندا کەزیو بسکی لەبەر دابێنن!
لەوەتی گەردوون پێدەکەنێ
مانگی ئەوینم لە ریچکەو رکانی تاریکیدا
سەرەتاتکێ دەکاو دووکەڵ راوی دەنێو
شمشێر بەدەستەکان هەرەشەی لێ دەکەنو
پرچە زەردەکەی لە شەقامەکاندا
دەکەن بە سووتوو

بەڵام ئەو هەر گۆرانی دەچڕێو
ئاوازەکانی وەکو کۆمەڵێ منداڵی لاسار
باڵەخانەکان پڕ دەکەن لە دەنگ
دەنگی مانگی ئەوینم
دەگاتە هەموو دەرگا و قەڵاکان
دەنگی مانگی ئەوینم
ئەو هەتاوەیە کە ئەسکەندەری مەقدۆنی
نەیتوانی لە دیۆ جینۆسی زەوت کات...!
دەنگی مانگی ئەوینم... شادی یە شادی...
ئایە ئێوە چەژی شادیتان کردووە ؟

قوڕ بەسەر ئەو کەسەی دلداری لەگەڵ شادی دا ناکا
گێل ئەو کەسەی لەشەوە بوکەنەکاندا
چەرمی پێی بەدوای شادی دا چەقۆی دڕکودا ڵ
نایخوات..!
گەلێ جار دەڵێم زمانی خۆم لغاو دەکەمو
وشەکانم لە بەستەڵەکی شەودا زیندە بەچاڵ دەکەمو لەنووسینی هەموو
هونراوەیەکدا
پەشیمانی یەکی ژیلەمۆ ڕەنگ گێنگڵم پێ دەدات
وەکو پەشیمانی باوکە ئادەم
دوای کرۆشتنی سێوە قەدەغەکە...!
بۆ کێ بنووسم ؟
بۆ کێ توێژو کاژی دەستو پەنجەو ڕووناکی چاوم
بە قەلەمو دەفتەرەوە مێش و مەگەز بیلیسنەوە ؟
بۆ کێ گورگی هەژاری لە ماڵە تاریکەکەمدا پەروەردە کەم ؟
ئەوەتا برسێتی یەکی قورسی گوریسی خۆی
لە ملمدا شەتەکداوەو
بەپانیو بۆری گێتی دا خولم دەدات
ئەوەتا هەژاریی وەك لافاو ڕام دەماڵێو
منیش لە جەرگەی شەپولە بەرەلاکانی دا
وەکو منال ترس دەمگرویو ئەزنەك دەدەم
من دەمەوێ هەرچی خۆشی دنیا هەیە
بیکەم بە چرای زنجە تاریکەکان
بەلام لافاوە تاریکەکە وەك ئەژدەهاك
ددانم لێ جیڕ دەکاتەوە
دە ئەی دەستە برسی یەکان
با بەهەموومان بەربەستێك دروست کەین
دژی لافاوە تاریکەکە
ئەوەتا مناڵەکانی ناو مناڵدانی مێژوو
بە دووچاوی پڕ لە قۆزاخەی خەندەوە
سەرنج بارانمان دەکەن.
پڕ بە هەموو هەستیم گوێم لە دەنگیانە
بانگمان دەکەن:

ئەو رەشە بایەش باڵ بەست دەکەم
کە شووشەی چرا دەم بە خەندەکان
بە زمانە دووکەڵەکەی تەڵخ دەکات...!
- من ئەو ئاگرەم کە هەرگیز ناڵەو نیڵەو نرکەم
نابێ بە زێی خۆڵەمێش
( ئەوە دەنگی دڵمە)
- من ئەو چەمەم کە هەمیشە رۆژ وەك پەریەیەك بە نهێنی مەلەم تیادا
دەکات
(ئەوە هاژەی خوێنەکەی مەلا ئاوارەیە)
- من ئەو خۆرەم کە هەرگیز کرمو مێشوولەی شەو
بە تیشكو پرشنگم ناکات
(ئەوە دەنگی ئەو منالآنەیە کە هێشتا پێیان
خاکی زەوی ماچ نەکردووە)
- ئاگادار بن لە هەموو میرنشینییەکدا
لە شکری یەك هەیە
(ئەوە دەنگی خانزادە)
- ئەرێ ئەم تارماییانە مرۆڤن یا کەنو...؟
(ئەوە دەنگی ئەحمەدی خانییە)

● ● ● ● ● ●

گیانم بارانێکی خەستەو
بەسەر لقی ئەرخەوانی شادیمدا دەبارێو
لە سەر پەلو پۆکەیدا
هێلانەی هۆرەی ئاشقانە دروست دەکات...
کۆمەڵێ مندال گازم دەکەن:
- ئەی شاعیرە لاسارە برسییەکە
گۆرانییەکی تازەمان بۆ بڵێ:

● (هەرچی منالێك بەستەی دزراوە
هەزار بەستەی نوێ لە باوەش ئەکا
هەر دلۆپەیە خوێن کە رژاوە

هەزاران هەزار چرا گەش ئەکا
تاریکی وەکو ناڵی ئەسپ دەسوێ
دڵتان هەزاران خۆری تیا دەڕوێ
شەق ئەبا زالووی قوڕاگەی شار
زەوی پڕ دەبێ لە خەنینەی نوێ)
- لە هەوارگەی خانوویەکی سووتاودا منالێـک دەگریـا لێم پرسی: چیت دەوێ ؟
گوتی: چلێك زەیتوون
لە باخێکی بە قەرە برووت کراودا باڵندەیەك
قونە قونی بوو..
لێم پرسی: چیت دەوێ‌و بۆچی دەگەڕێی ؟
وتی: چلێك زەیتوون
بە دڵدارەکەمم گوت: لە جەژنی یادی دڵداریماندا
چیت پێش کەش کەمو چیم پێشکەش دەکەی ؟
گوتی: چلێك زەیتوون
کە خەو پرچە سەوزەکەی خۆی بۆ کردم بە کەپر
لە خەومدا نەیرۆن زیندو بۆتەوەو بوەتە قەراڵی
هەموو جیهان‌و
بریاری دەرکردووە هەرچی دار زەیتوونی جیهان هەیە
هەمووی بکرێ بە خۆڵەکەوە...
بەر لەوەی دەستم لەملی بووکی خەو بترازێ
گوێم لێ بوو پیرە ژنێك گوتی:

● دەڵێن دوو برین لە سەر شانی نەیرۆن رووەوە
بە خۆڵەکەوەی زەیتوون نەبێ
کەف‌و کوڵی ژان‌و سوێی دانامرکێ...!
شەوێك هاوارم کرد: دەستی دایکم پڕە لە لقی زەیتوون‌و
گوڵی شادی..
تیرێکی ژەهراوییان لە دەستی دایکمدا چاند
براونن ئەوە خوێنە پیرۆزەکەیەتی
لە بەر ماڵماندا بووە بە کانی
ماڵەکەشمان ئەمەتانێ لە سوچی چەپی دڵمدا حەشارم داوە

نه دەستی گۆ دەکا روو بەرووی ستەم
شمشێر هەڵگرێ !!!
ئەوەتا لافاوە رەشەکە
کرمی پەتاو سەراسێ نە ماڵە هەژارەکاندا
رۆ دەکات
ئەوەتا گلۆڵەی برسێتیی‌یەکی هار
بووەتە رایەخێکی گەورە .
لە هەموو ماڵە هەژارەکاندا
ئەوەتا خەم بووەتە نالەبارترین درندەو
پەلاماری هەموو ماڵە هەژارەکان دەدات
دە ئەی شمشێرەکان
کەی لە کێلان دەر دەچن...!!!
«وا لافاوە تاریکەکە
هەموو زەوی داگیر دەکات
بواری رزگار بوون نەماوە باوەشی من نەبێ»
ئەوە دەنگی لووتکەی حەساروێست بوو...
کێ دەیەوێ لافاوە تاریکەکە قووتی نەدات
با لە لووتکەی حەساروێستدا تاشە بەردێك بکات بەماڵ...!

# پەلکە زێڕینەش ناوێ مەکەن

خاتوونێکی تەنیا
وا لەگیانما
دڵی کردووم بە: ئاوێنەو
خەونەکانم، بە: شانە
سەدان ساڵە چاوەڕوانە:
کابرای پۆستە
نامەیەکی بۆ بهێنێ
لە دراوسێکانم وایە
ئەم خاتوونە تەنیایە
بە بێهوودە چاوەڕێیەو
هەرگیز نامەی بۆ نایە
نامەکە لای کابرای پۆست–ە
بەڵام گیانم
بەبێ ئالاو ناونیشانە
خاتوونێکی تەنیای تیایە
دڵی کردووم بە ئاوێنەو
خەونەکانم، بە: شانە.

* * *

خاتوونێکی تەنیا
وا لەکۆشکی شیعرەکانما
کراسە ئاودامانەکەی: بینایيمە
هیوای کردووم بە: فەقیانە
بە: سۆزم چاوی ڕشتووە
هەناسەی کردووم؛
بە مێخەكبەندو ڕێحانە.
بە ڕاڕەوی کۆشکەکەدا؛ دێتو دەچێ
جارنەجارە؛ دڵم لەکەمەری دەخشێ
لە دراوسێکانم وایە:
ئەم خاتوونە تەنیایە
بەبێ هوودە چاوەڕێیەو
سوارەکەی ناگەڕێتەوە.
سوارەکە.. نا.
بەڵام ئەسپەکەی دێتەوە
لاوێکی خوێنگەرمی تر
سەرلەنوێ هەڵدەگرێتەوە.
ڕانكوچۆغەی زەردەخەنە

دەکا بەبەر دێڕەکانما
سەربەخۆ..
خۆی دەکاتەوە
بە ویژدانما
بۆ لای ئەو خانمە تەنیایەی
وا لەکۆشکی شیعرەکانما.

* * *

ئەم خاتوونە:
ئەسپی گەواڵەهەورێکی قەنەوزی
بۆ سەفەرەکەی خواستووە..
لە شاعیرێك..
کە وەکو خۆی تەنیایە.
ئەم خاتوونە:
تۆوی کچۆڵەیەکی چاورەشی؛ لە داوێنایە
توێشووی سەفەری:
بۆنی هەناسەی دارگوێزو
قاسپەی کەوی چیایە
لەناوەند جەنگەڵێك گورگا
بۆ مەزاری..
کانی‌یەکی زیندوو.. ویڵە.
خەڵکی دەڵێن: گورگ دەیخوا.

بەڵام.. نا.
دەگاتە کانی‌یەکەو
خۆی لێ‌دەشوا.
کچۆڵەکەش:
وەك چەپکێك کام
لەداوێنی دێتە خواری‌و
تێکەڵ دەریای ژیان دەبێ.
باران:
بۆی دەبێ بە قومات.
نێرگز:
دەبێ بەگوارەبی‌و
خۆر:
بۆی دەبێ بە جۆلانە.
پەلکەزێرینە:
قوربانی دەبێ‌و
خۆی بۆ دەکا بە: پاوانە
هەی‌باران بارانە
باران.. بارانە
شاعیر؛ ئەسپەکەی،
دەکا بە «باربووی»
ئەم کیژە جوانە.

عبدالرحمن مزوری

### ١ ـ سلاڤ

ئەگەر تو برێکەکێدا چوی .
تە جوانەك دیت
بەژنا وی یا شەنگ وشەپال
گەلەك گەلەك
ژ بەژنا تەرحید چناری ..
شرنیتر بو
پیلا پرچاوێ یا زێرین
ژ بێلێد گووم وریبارا ..
بلنرتر بو
گەرمیا هەردو چاڤێدوێ
ژ ئاگری هزار کوچکێد زڤستانێ ..
گەرمتر بو
تو بخودی کەی ، ژی نەبورە
ئەو پەری براست ودروستی ،
واریٚ منە
هێلین وئاقاریٚ منە
نەنە بورەژ ویٚ خاتوینیٚ
تو سلاڤێد ئاگرینید من بگەهینیٚ
تو بگەهینی .

### ٢ ـ وەلات :

نە من گەنج وخزینەنە ،
ئەڤرو ژ بەژنا تەرا بدەم
نە من پەلکە زێرینەنە ،
هنداڤ سەریٚ تە ئەزڤەدەم
نە من ستران ولاوژنە .
بوتە نە بیژم یان نەدەم
وەلاتێ من .. من چ هەیە ..؟!
ئەڤە دلی من سیڤەکا بەروباریانە ،
دیٚ هاڤێژم لسنگی تە دەم
لسنگێ تەدەم .

## ٣ ـ فەقیێ تەیران:

هەی ئاف وئاف.. هەی ئاف ئاف
تە دل تژی رازو سرە،
تژی کەرداف
راستە هەنە دپەرپەرێ چاخێ بیتێدا..
بو نانەکا سوتی وخاف
خو بکەنە تاژی بو خەلکی،
بکەنە پێلاف
خو بکەنە تاژی بو خەلکی، بکەنە پێلاف !!

## ٤ ـ میهرەبانا بەرواری:

شەڤا چوی..
دخەویدابو
سیارەکێ لاوو هەژی
دێم کرنژی
هات و دگوت:
چەوا بەفرەمی سالان:
خەملا سهی پلبوکینێ
دبەخشیتە چووول وبەیلرا
چەوا رویبار
دگەل سیارێد مزگینییا گەشە سپیدێ،

شەدکەت کەزیێد [illegible]
چەوا فەرهاد..
ژ کورپا چاڤێد (شرینێ)
هەردسوێیت [illegible]
میهرەبانێ، میهرە[illegible]
ئەزی پسیلەکێ [illegible]
دریکا کەمیا عشقا [illegible]
وەکی فەنارێد [illegible]
دێ خو سوژ [illegible]
شەوتینم:

ئەگەر عەشق نەبێت شاعیری دڵ تەنگو غەمبار نابێت.. ئەگەر شاعر خەفەتبار نەبێت شیعری ناسكو دڵ هەژێن نابێتو.. ئەگەر شیعری جوانو دڵ سووتێن نەبێت، ئاوازی پڕ جۆشو خرۆش نابێت، وە ئەگەر ئاوازی پڕ جۆش نەبێت بەستەی دڵ فڕێنو مەیلی پڕ لەسۆزو تەزووی پڕ لە ئارەزوو نابێت !.. كەوابو ئەڤین سەرچاوەی ئیلهامی هونەرە جوانەكانە.

# من عاشقم

محمد أمین پێنجوێنی

وەك پەپوللە ئەشقی گڕم
هی جوتیاری پێخاوسی ڕانك شڕم
ئەشقی سواڵكەرەكانی جاوەو گۆڕەپانم..

هی چەوساوەو زەحمەت کێش و پاڵەو شوانم
هی لانەوازو بێ لانەی شەوانم
هی ئەوانەی لە دووڕێیانی شەقاما
لە نەسرەوتی بێ ئاراما
لە بن ترافك لایتەوە
هەڵ توتاون
سەرتاپای لەشیان زوخاون

● ❋ ● ❋ ●

لە پەنجەرەی ماشێنەوە
بەچاوی پڕ ئەسرینەوە
بۆ درهەمێ
کە بیدەمێ
دەستی درێژ ملی خوارە
زۆر بەکزی لەژێر لێوەوە
بە شەرمەوە
ئەز باب نیە باب نەماوە
ئینجا منیش ماشێنەکەم لەلا (مارەکەی شێخ هۆمەرەو)
لە دەستو قاچم ئاڵاوە
خۆیشم لەلا وەك قەقنەسەو
هەموو کەون کائنات و سیتەمێکم !
لا گلاوە؛ لا گلاوە....!!

● ❋ ● ❋ ●

من ئاشقم
ئەشقی تاشە بەردی زلم...
هی کولۆرەداری دارستانی پڕو چڕم
ئەشقی دەوەن، هەردو شاخم..

هی لاوێکی یاخی بووی ڕیش نەوگی بەدەماخم...!
ئەشقی سەهەندو لەیلاخم...
من ئاسقم باوەڕ بکەن
گەر پەتیشم بۆ هەلبخەن...!
من دێوانەم
من ئەشقی ئەم کوردستانەم...
من ئاشقی [توێشەبەرەی هەژارانم]..!
شێتو شەیدای مندالانی بێ باوانم
هی ئەو خەلکە ئاوارەیەم
بێ زەوی‌و بێ کارەیەم
سوێنتان ئەوێ...
من ئاشقم سوێند بە خوا
بە لوتکەی بلندی چیا...!
بە ئەشکەوتی قولو سەنگەر

بە خوێنی ئالێ تێکۆشەر..
بە ژووانی ترس‌و لەرزی نوێژی شێوان..!
سوێندم بە ماچی تامەزرۆی دەمەو بەیان
بە مەمکولەی قوت‌و پڕ چنگ...
بە قژی لوولی [هەلەکوك]...
بە پەلکەی خاو وەك گەلای [شنگگ]....
بە ئارامی باوەشی ناز...
بە وشەی پاکی سەرفراز...!

● ❊ ● ❊ ●

من عاشقم
بە [وەنەوزی] چاوی ئێشکچی دڵ وریا...!

بە پاسەوانی بە ئاگا....
سوێندم بە کچ بە ئافرەتی نەترس و مەرد....!
سوێندم بە شاخ، بە دارو بەرد
سوێند بە [پلوسکی] خوڕی...
کانیەکانی ناوقەدی شاخ...
بە هەناسەی ساردو سڕی...
پڕ ئوفو ئاخ....
سوێندم بە چاوی گەشی بز
بە لاپالی هەورازو خز...!

من عاشقم
بە دایکی جگەر پارەی
دەروون برژاو....!
بە باوکی وێلو ئاوارەی
بۆ جەرگ گەڕاو....!
بە قولایی زیندانەکان
بە خەنجەری تیژی دەبان....!
باوەڕ بکەن من ئاشقم
چۆن شەیدا نیم ؟
هەموو ڕۆژێ لە هەر چوار پارچەی دڵەکەم....!!
بە کێردی کولی ژەنگاوی...
پلە پلەی لێ ئەبڕن و بە سوتاوی....!!
دەرخواردی خۆمی ئەدەن..!
ئەنجینەکەن ئەی کوتنو ئەنجینیەکەن....!
چۆن ئاشق و دێوانە نیم..؟ چۆن ؟
شەیدای ئەم نیشتمانە نیم..؟ چۆن ؟

شورەییە

هیچ کەس نقەی لێوە نایە...!
شورەییە
نە مرۆڤێ نەدرنجێ نە دەعبایە...!
کوا ؟ داد کوا ئازادی خوازان ! کوا ؟!
کوا «پەی ڕەوی» ئەرزو ئاسمان ! کوا ؟!
کوا مرۆڤ پەرست، کوا ویژدان ! کوا ؟
کوا بڕیاری نەتەوە یەکگرتووەکان ! کوا...؟

● * ● * ●

لەلام ڕوون و ئاشکرایە...
بۆ هەموو عورفێ ڕەوایە...
هەر کوتەکە کە بە قوناغ ئەبا [پەی]!
بە دەستی خۆت، خۆت نەخورێنی
نالێی ئۆخەی نالێی ئۆخەی...
باوەڕ بکەن من عاشقم
عەشقی خاکم
عەشقی پاکم
عەشقی چاکم

● * ● * ●

---

● ئەم شعرە لە ئاهەنگی شعرخوێندنەوەی ئەوڕۆژدا خوێنرایەوە.. کە ڕۆژی ۱۹۸۵/۳/۲۲ یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لقی سلێمانی گێڕایان..

خۆش خوێنی هەیەو، بە ڕێنووسی کۆن دەسخەتەکەی
نەخاکەن فەتاحدا

# گەڕانەوەی شاعیر

فەرید زامدار

**ئەگەر چاو، پەنجەی هەبوایە**
**جوانترین هۆنراوەی دەنووسی**

دوێنێ لێرە
سێبەری شیعریکی یاخی
بە شاخێکی بێ لوتکەدا هەڵدەگەڕا
دوێنێ لێرە
ڕۆژ هەر سووتاو دانەمرکا
لەو کوێرە دوورە بەرزەدا!

وەکو هەورێکی بەهاری
شەوو بەفرو شیعرو چیا
زەماوەندی...
بووکی بارانیان دەگێڕا

دوێنێ لێرە
هۆنراوەیەك خۆی دەسووتان
بەدرێژی باڵای دووکەڵیاو
بە هەورازی بەژنی خۆیدا.. هەڵدەگەڕا
سووتانی خۆی دابەش دەکرد
دەبوو بەڕۆژ بەڕەشەبا!..

ڕۆژگارێکی دوورو درێژە
کامە ڕێ ئەستەمو لێژە
خوێنی بەفری تێدا دەڕوێ
جۆگەی شیعری پێدا دەڕوا
لە هەموو لا...
شەوو بەفرو شیعرو چیا
بۆ مردنی... تاریکیەکان
دەبن بە بینایی شەوبا !..
دوێنێ لێرە...
ڕۆژ هەر سووتاو دانەمرکا...

لەو گوندە دوورە سەوزەدا
شەوو بەفرو شیعرو چیا
زەماوەندی...
بوکێکی ڕەشپۆشیان گێڕا

ئەویش بوو شیعرێکی پاکی
بەشاخێکی بەفراوىدا
هەڵدەگەڕا...
گەیشتە لوتکەو هاتەوە
بوو بە ڕەشماڵێکی بەرین
ڕووی ئاسمانی تیا شاردەوە !..

لە هەموو لا
شەوو بەفرو شیعرو چیا
دەبنە ڕێ بۆ
گەڕانەوەی
ئەو لوتکانەی
ووشەی گەشیان تێدا ڕووا

دەروونی مانگ
لە گوندێکیوا بچووکدا.. قەت ناخەوێ
شارێکی بچکۆڵەی دوورە
خەونی دوێنێی تیا ناسرەوێ
لە ڕووانینی خۆی دەترسێ
چاوەکانی
لە دیتنی شەوا تیژن
شاخ و بەفرو هۆنراوەی تیا...
بۆ بەرزایی..
بۆ دیدەنی ئاسمان دەڕوا

[illegible] بوو
هەتاو بە کڕێوە هەڵگەڕا
بە دووای ڕۆحێ بەفر گەڕا
خەونێکی ساردی ناوەختە
بەفری کرد بە زمانی شەختە،!..

زەمین دەڕوا
لە مێژساڵە، هەر زەمینە سەفەر دەکا زەمین کەینێ
کۆتایی دێ ؟..
زەمین کەینێ
بارگەی کاروانی خۆی دەخا ؟..
کێ دەتوانێ (ڕۆژ) بنوسێ ؟..
هەر چاوەکانی ڕۆژگارە
لە رووانینی بلندی خۆی‌دا!
بێ‌ترسی هەنگاوی تەمەن
بە دوووای سێبەری شەواندا
بێ ڕاوەستان
دەڕواو دەکشێ !..

هاوینی ١٩٨٤
«دەرگەڵە»

# هەنگوینە خوێن

شیعری
صلاح محمد
١٩٨٥

تۆپەڵە بەفرەکەی دڵت دەستەکانمی سڕ کردووە
کێ ئەتوانێ بڵێ ماوەو
کێش ئەتوانێ بڵێ ئەم پیاوە مردووە

* *

ئەم ساڵ لە ساڵان سەختتری
کۆچ و باری هەورو بەفرەو
لەپەنجەکانم وشك تری
خۆ ئەمبینی

منی مناڵ
لە ژێر سایەی دایکێتی ئەو درەختە شەنگەدا
پرچی فرمێسك ئەهۆنمەوەو
ڕێژنەی دڕك لەڕوم ئەدا

* *

تافی عیشق و لاوێتیمە
ئاسمان هەر وا بەسەرمەوە
سەرت هەروا بە سنگمەوە
لە گۆرانی بێزار نەبوین
هەنگوینە خوێن
بۆیە هەتاکو ئێستاکەش

تا لە خۆشمان بێزار نەبوین

* *

ئەو کچۆڵەیە عاشقە
چەپکێ ئەستێرەی پێشکەش کە
ئەگەر نەبوو
چاوەکانی من دەربێنەو
بۆی وورد، وورد کە

* *

پاییزانێکی سەخت دێ
لەبری هەور،
درەختەکان، بەسەر سەری ڕێبوارەکانا دەبارێن
نە ئەوان لە هەناسەی کۆچ دەگەن
نە پێیەکانیش لەسەر گەڵاکان دەسوتێن

* *

ئەم هەموو عیشقانە، سوتانە
بەم زستانە
منالی خۆش بەختی منیش
هەموو لەشی شوێن چەقۆکانی سەرمایە
ژێری تەڕەو
سەریشی بارانو بایە

● شەوێك خەمی هەموو دنیام دەهۆنیەوە
تۆ لە خەوما سورە چناری وولاتی خۆم بووی..
هەر چەند دەمکرد قەت لە کۆڵم
نە دەبویەوە..
پێت دەوتم: -
زەمانی من کۆنە لەگەڵ زەمانی تۆ
لێت ناتۆرێم..
تۆبینیوتە..
قەت ئەستێرە لە مانگی ببیتەوە..
حەزم لێتەو خۆشم ویستووی..
چۆن ئازاری یەکەم ماچت..
وا زوو لەدڵ بەسەر دەچێو کۆن دەبێت و
دەسرێتەوە.

● منیش بۆیە ئەمرۆ دەروونی خۆم دەسوتێنم..
دەبمە لالە..
هەر بۆئەوەی قەدو باڵات قەت وون نەبێو
لە زەمانی مەینەتیشا..
ئەگەر لەناو دەیان چاوی شەوە زەنگ بی
شاژن بیت و
وەك مرواری..
سەرت کۆك بێو
بدرەوشێیت و هەر قەشەنگ بی..

# دوو پــــــارچه شیعر

□ عوسمان شەیدا □

## پارچەی یەکەم

لێرەش دڵم لەلاتانە
دەڵێی تەمەن.. هەموو تەمەن
خۆرنشینی ئەم ئێوارەیەی تشرینە
ئیتر ئاوا نابێتەوە..
کە نسرمە بایەك دەدا لە ڕوخسارم
بە خۆم نیە، لە سەعاتەکەم دەڕوانم
یا هەورێکی ڕەشی وەك قین
لە ڕوی ئاسمانێ دەئاڵێ
حەزم لێیە پاڵتۆکەی بەرم دامالْم
بیکەمە بەری زارۆیەك..
هێشتا چاوی خەواڵووەو.. بەیانە بۆ مەکتەب دەچێ
دەڵێم: نە با سەرمای ببێ
ئەی خەمە پێ ڕەوکەکانم..
مەیلم نێرگزە جارێکە
بە شەماڵی نیگای ئێوە.. دەشنێتەوە
ساتێك چی‌یە ؟ لێتان ببڕێم
دەبمە وەردی بێ بارانی نەهاتە ساڵێکی تەمەن..

منالە قژ زەردەکانم..
مەگەر ئەم خاکە لە ئێوە ئازیز تر بێ
ئەوە نیە پاڵم داوە بە خەمێکی زۆر قورسەوە
وەك تەزبیحە قەزوانی‌یە درێژەکەی دەستم
دەنك.. دەنك، بچوکترین یادگارتان
بۆ ـ پۆست کارت ـ ٥ دوو قۆلی‌یەکەی
بەر باخەڵم دەگێڕمەوە ؟

● ئێرە ماڵی وەك ماڵە قوڕینەکەی ـ نەنە ـ ی تێـدا نیە
شەقامی قیری لێ نیە
قوتابخانەی بەرزو بەردینی لێ نیە
وەك قوتابخانە کەی ئێوە
ئێرە گوندێکی ماندووە
ئێرە گوندێکی دەست کورتە وەك ـ دایە ـ تان
گوندێکی سیما تۆزاوی تازێ بارە
ئێرە گوندێکی هەژارە
ئازیزان.. شنروێ وئاسۆ
هەندێ سات هەیەئارامم
ئاورێکی بێ ئۆقرە یی تێ بەر دەبێ
بەخۆم نیە بیرتان دەکەم
شەوێك نیە..
بیرکردنەوەم لەچاوانی گەشی ئێوە
نەمداتە دەست گەشکەی خەونێ..
پڕ لە نەشئەی شادبوونەوە.. بەدیدارتان
پڕ نەبێ لەچەپۆکی نازی
گەمەی نێوان باوك ومنداڵ
وەلێ چ بکەم ؟
کە بەسەر حاڵما دێمەوە
مرۆیەکی بەستە زمانین
هەر چەند لەتەمەن دەروانین
شکستی یەونە هاتەساڵ..

## پارچەی دووەم

● بابە.. ئێستا سەعات چەندە ؟
دەمخوێندەوە.. چاوم لەسەر دیوانە شیعرییەکەی «نازم» تروکاندو..
بابە.. سەعات دوو چارەکە

● یانی دایکم کەی دێتەوە ؟
دوای تاوێکی دی دێتەوە..

● تاوێك چەندە ؟
تاوێك ئەوەندەیە «داریوش» گۆرانییەکـەی چڕیو ئیتر
تە لەفزیۆن ـ مان بێدەنگ کرد..

● ئای چەند زۆرە.. ئەی دوای ئەوە ؟
دوای ئەوە ئیتر دێتەوە
لە جەڕەسی دەرگا دەدا
ئێمەش بەرەو پیری دەچین
دەڵێ: ڕۆژ باش
ئێمە وەلام تەواو ناکەین.. ئەو تۆ لە ئامێزی دەگرێ

● بابەگیان.. توخوا پێی بڵێ
بەدلە شینەکەی سەرشانی فڕێ بدا
من ـ دایە ـ گیانم خۆش دەوێ هێندەی چاوم
بەلام بابە
حەز لە بۆنی تووتن ناکەم
ڕۆڵە گیان.. ئەگەر ـ دایە ـ ی تۆ
بەدلە شینەکەی تورِ هەڵدا..
زەمیلەکە ی خاڵی دەبێ..
بەچی بژین ؟
پێلۆوە کاڵەکانی لێك نا

تۆزێك مات بووین
هەناسەیەکی ئاوری بەسەر «مێوژی زۆراب»ی
کتێبەکەی نێو ئامێز یا.. پەخش کردو.. ئەوجا پرسی:
باشە.. بابە ؟
گرێی پرسیار لەزمانە گچکەی ئالا
باوەشمان بەیەکدا کردوو..
سەعات شەش بوو..
دایکی گووتی:
هەڵسن نانەکەتان بخۆن

سلێمانی ١٩٨٥

# تۆ ئەسووتێیت و...
# کەچی خەڵکی لە
# دوورەوە، نیگات ئەکەن..

□ بورهان هەژار □

کە خەم ئێوارەی لێدێ
پرچی زەردی،
بە کەمەرو سنگی ئازارا
ئەپێچێ..!
ئەمشەو تەنیام و
پەنجەکانم،
لە نێو گڕی دەریای حەزا
ئەسووتێنم..!؟
بێ دەنگیەیەك سەما ئەکاو
کاسەی سەرو ڕقی پیرۆز
ئەوروژێنێ..!؟
لە کۆڵانی،
شاری تاریکی وون بوودا
بۆت ئەگەڕێ..!
تۆ ئەسووتێیت و
ئاسمانی شەوی ئەم شارەت
ڕۆشن کردەوە..!
وا زستانە کرێوەیەو

دنیا تۆفه..؟!
تۆش ئەسووتێی هەر ئەسووتێی..؟؟
کلپەو گڕی پشکۆکانت
دانامرکێن.!؟
(کەچی خەڵکی لە دوورەوە،
بە سەرنجێ نیگات ئەکەن..
ڕادەبوورن..!
نایەن مشتێ گڕو پشکۆت
بهێننەوە..؟!
بۆ ئاگردانی ساردو سڕ..
تا خۆیانو
منالانی ڕەشو ڕووتیان،
لە کڕیوەی ئەم زستانە
بپارێزن..!*[1]
هەیرۆ کەنیشکەی،
زامی ئیوارەو حەزی خەمەکان
من چاوەڕوانتم..!؟
دەوەرەو ئیمشەو
لە کەشکۆڵی زامەکانا
بۆم بگەڕێ..!؟
بۆیە ویڵێ شۆخە کچێکم
دەزگیرانم بێ..!؟
لە ساتەکانی ژیانا
ئاوێتەی خەونو خەمەکانم بێ..!؟

بەغا ـ شەوی ١١/١٢/١٩٨٤

---

تێبینی:-

---

* ـ ١ ـ ئەوەی ناو کەوانەکە لە بیرۆکەی نامەکەی ڤان کوخـەوە وەرگیراوە کە بۆ (سیووی) برای ناردووە بە دەستکاری‌یەوە...

# که وەرگێڕان ئەگاتە ترۆپك

**عبدالقادر دەباغی**

گۆڤارە هێژاو پڕ تام و چێژو ڕازاوەکەی «**نووسەری کورد**» بۆ هەوەڵ جار لە ژیانم دا، چاوی منی پیری کەفتەکاریشی روون کردەوەو دلێ پڕ تاسەو تامەزروی گەشاندەوە، دەستتان هەر خۆش بێ‌و خودا بتان پارێزێ.

لەم ژمارەیەدا (**ژمارە 1 خولی سێهەم ئاداری 1985**) لە ژێر سەردێری سەرەوە کاك مەحمود زامدار چەن دێرێکی پڕ ناوەرۆکی نووسیوەو چوارینەیەکی لە رۆژنامەی کوردستانی سەردەمی کۆماری کوردستان و ئازادی نیشتمان بلاوکردوەتەوە کە کۆنە برینی کولاندەوە.

لە بەر ئەوە کە برای خۆشەویست کاك زامدارو هەر وەها نووسەرانی دیکەی کوردستانی عیراق ناشارەزای ناوچەی موکریان و شاعیران و زانایانی ئەو ناوچە پان و بەرینەن، ناوی شاعیرەکەی (**مەلا ئەمجەدی عوسمانی**) بە شێوەی خۆیان (ئەمجەد ـ عوسمان) نووسیوەو هیچ جێگەی رخنەش نیە، بەلام گەلی کورد لە کوردستانی خوێناوی ئێران، حەقیانە گلەیی لە کەسانێکی وەك هەژارو هێمن بکەن و بەتوندیش رخنەیان لێ بگرن کە چەندین ساڵ لە کوردستانی عیراقدا ژیاون و بەرهەمی ئەدەبی خۆیان بلاوکردۆتەوە، لە کۆبوونەوەی زانستی‌و ویژەیی تایبەتی زمان و بەرهەمی ئەدەبی قسەیان کردوەو وتاریان نووسیوە بەلام سەبارەت بە شاعیران و هونەرانی هونەرمەندی وەك ئاغای سەیف (**سەیفی قازی**) کە سەر قافڵەی رەسەن بێژی‌و نیشتمان پەروەری هونەرانی موکوریانە یا کاك هەباس حەقیقی، سەید کامیل ئیمامی، مەلا ئەمجەد عوسمانی، سالار سەعیدی حەیدەری، خاڵەمین، عەتری، پەشێوو دەیان شاعیری تر، قسەیان نەکردووە، هەڵبەستێکی ئەوانیان نەخوێندوەتەوە، سەر بە هەردوکیان بلاونەکردۆتەوە.

بۆیە بلاوکردنەوەی ئەو چوارینەو نووسراوە شرینەکەی کاك مەحمود زامدار هانی دام کە بەم چەن دێرەو بۆ ژیانەوەی ناوی پڕ لە شانازی ئەو شاعیرە نیشتمان پەروەرانەو

خزمەتێکی بچووك بە کەلەپووری وێژەی کوردی کورتە باسێکی ژیانی مەلا ئەمجەدی عوسمانیو بیرەوەرێکی سەیفی قازی، پێشکەشی خوێنەرانی بەڕێزو ئەو ئەدیبانەی کە بە شوێن هەواڵی ژیانی شاعیرانی نەناسراو یا کەم ناسراوی کورددا دەگەڕێن، دەکەم.

دیارە دەسەڵاتداری ئیستای ئێران واتا حکوومەتی ڕەش و کۆنەپەرست و خوێن مژ و دژمنی ئینسان و کورد کوژی خومەینی جەلاد، گەلی کوردی بەکافری موتڵەق و یاخی کەللە ڕەق داناوەو فتواو فەرمانی قەڵاچۆو تواندنەوەی لەمێژە داوەو سەرەڕای ئەوەش لەو ڕژێمە سەدەی ناوەڕاستیەدا زمانی شاعیران بەستراوە، قەڵەمی نووسەران شکاوە، دەرکە زانستگاکان داخراوەو شوێنەوارێ لە هونەرو مۆسیقاو ئەوین و جوانیو پێکەنین نەماوەو ئازادی بەجارێ فەوتاوە، ئاشکرایە کە ئیجازەی خوێندن و فێربوون بەزمانی زگماکی لە کوردی یا عەرەبی یا تورکی، کوفرەو کەسێ داوای مافی ڕەوای مرۆڤایەتی بکات بە ناوی (مفسد في الارض والسماء)[1] لە عاسمانیش وەگیر جەلاد کەوێ دەکوژرێو خوێنی دەرژێ، لە بەر ئەوە هەر چەندە نووسراوەکەم کەم و کورتی هەبێ بە داوای لێ بوردنەوە تکاتان لێەوکەم بۆ ناسینی شاعیرە نەناسراو یا کەم ناسراوەکان بڵاوی بکەنەوە دەنا خۆیشم دەزانم کە نووسراوەی یەکێکی وەك من ڕووی مەجلیسی زانایان و ئەدیبانی نیەو لاقە مێرووله‌یەکە لە سەر خوانی سولەیمان.

مەلا ئەمجەدی عوسمانی کە لە بەر ئەوە کە لە گوندی قەڵای ڕەسولی سیت[2] مودەریس بووە بە مەلا ئەمجەدی قەڵا لە موکریاندا ناو بانگی ڕۆیشتبوو، ناز ناوی شیعری **«ئەمجەد»**ە، لە ساڵەکانی 1944 و 1945 لە سەردەمی ڕاپەرینی کۆمەڵەی ژ ی ـ کاف لە شادی چاو جوانان، شارە ڕازاوەکەی بۆکان لە خزمەت زانای کورد پەروەر خوا لێ خۆشبوو قازی کاکە حەمدی قزڵچی بە خزمەتی گەیشتم، ریشی ماش و برنجیو چەند ڕۆژێك بوو کە شەرەفی ئەندامەتی کۆمەڵەی ژ ی ـ کاف ی وەرگرتبوو، زانایەکی دڵسۆزو نیشتمان پەروەرو کارامەو شاعیرێکی نیشتمانی بوو.

لە باری شیعریەوە موریدی سەر قافڵەی شاعیرانی موکریان **«ئاغای سەیف»** سەیفی قازیو ئەوینداری شیعرەکانی بوو. مەرگی سەیفی قازی، ئەمجەدی شاعیرو موریدی شڵەژاند، زۆر جاران دەیگوت، وەفاتی ئاغای سەیف بۆ کوردو کوردستان خەسارێکی گەورە بوو.

بڕە وەختێکیش کە شیعری (کوردینە)ی سەیفی دەخوێندەوە فرمێسك لە کالانی چاویدا قەتیس دەبوو، مەلا ئەمجەد لە مەرگی سەیف دا شینی گێڕا.

رۆژنامەی کوردستانی ژمارە (8) روژی دووسـ
(28)ی ژانـویـەی (1946)ز، بە هۆی هەولین سالی کۆچی سەیفی قازی، وتـاریکی نووسیوەو لە کوتایی دا دەنووسێ.

مەلا ئەمجەدی عوسمانی ئەم شیعرانەی لە شینی وەفاتیدا داناوە:ـ

---

وەرن هاوارە کوردان، رۆژی شیـنـی کوردە، قەومـاوە
چرای وەك حەزرەتـی سیـف الـقـضـات[٣] هەر لیـمـە کووژاوە
کە زاتـیـکـی وەك ئاغـای سەیـف، وەفـاتـی کرد بە مەعـلومـی
بنـاغـەی دیـن و زانـیـن، نەقـسـی هێـنـاوە پاکـی رووخـاوە
نەمـانـی پیـاوی گەورە پشـت شکـیـنـی میـللەت و دیـنـە
لە دنـیـادا دروسـت مەعـلومـە، هەر پیـاوێ بە سەت پیـاوە
بەفـەوتـی پیـاوی وا ناقس دەکـا حەق، ئەم کورەی خاکـە
بۆ خۆی فەرمـوویـەتـی «مـافـي الارض تنـقـصـهـا» لە هەر لاوە
بە نووسـیـن وەسـف و چاکـەی ئەو تەواو نابـێ بەتـۆ ئەمـجـەد
ئەگـەر سەت دەفـتـەری گەورە بنـووسـی و بێـتـە ئیـشـارە
وجـوودی ئەو کەسـانـەی لیـێ بە جێ ماون سەلامـەت بی
بەلـێ دنـیـا بەقـای بۆ کەس نەبـوو، نابـێ لەمـەو لاوە
هەزار رەحـمـەت لە جێـگـاو مەرقـەدی ئەو بێ هەتـا مەحـشـەر
بۆ ئەو ئەولادە چاکـانـەو بۆ تەرتـیـبـێ رۆی ناوە
بەلـێ بابـی وەهـا ئەلـبـەت دەبـێ ئەولادی وای لێ بێ
لەجـێـگـەی پیـاوی چاك، چاکـتـر لەوانـە[١] کوا بەجـێ ماوە؟
غروبـی حەوتـی «بـەهـمـەن»[٥] رۆحـی پاکـی رۆیـی بۆ جەنـنـەت
غروبـی رۆژ هەمـیـشـە بۆ بەشـەر تاریـکـی هێـنـاوە
بەخـوێـنـی چاوی کوردان، نوقـتـەدار بوو حەرفـی تاریـخـی
لە دوای ئەو عەیـشـی کوردی بوو بە غەم، ئازاری بۆ ماوە

~یی بەم سینەو بە چوارینەکەی لای کاك مەحموود زامدار پایەی بەرزی شاعیری مەلا ئەمجـەدی قەڵامـان بۆ دەر دەکەوێ‌و هیوا دارم ئەو کەسانەی شیعری **«ئەمجەد»** یان لایە هیمــەت کەن و بە بڵاوکـردنـەوەیـان ئەرکی نیشتمـانی خۆیان بەجێ بێنن.

## پەراوێز

1 ـ مفسـد في الارض: تا ئێستـا دەیـان هەزار زانـاو ئەدیب و شاعیـرو تێکـۆشـەری ئێران بەو بیانووە گوللە باران کراون یاخنکێنراون، گەلانی ئێران بە توانج و تانە ووشەی والسماء یان دەگەڵ خستووە.

2 ـ قەڵای رەسولی~~سپیت~~: گوندێکە لە بەینی مەهابادو بۆکـان و میـانـدواو، جێگـایـەکی خۆش و کەونایە، نەقشی شێرو ئەسپی لە کیوێکی هەلقەندراوە کە مەعلووم نیە هی چ زەمانێکە، لە گۆرانیە فولکلۆریەکانی موکوریان دا باسی قەڵاو ئاجی ئاباد زۆر کراوە.

3 ـ سیف القضات: لەقەبی حەسەن (سەیفی قازیە) گەورەتـریـن قەسیـدە بێـژ ی کوردەو ناز ناوی شیعـری (حەسەن) ە مامی پێشەوای شەهیدو باوکی حەمە حوسەین خانی شەهیدە.

4 ـ چاکتـر لەوانـە: مەبـەستی زیـاتر لە حەمە حوسەین خانــە چونکـە ئەو وەختــە دوکتــۆر رەحیمی قازی تازە پێ‌گـەیشتـوو بوو بەڵام حەمـە حوسـەین خان کەڵـە پیـاوی موکـوریـان و پێشمــەرگـەی کوردستـان بوو و هەر بەو تاوانەش!! شەهید کرا.

5ـ بەهمەن: یازدەهەمین مانگی فارسی‌یە کە دەبێتە رێ بەندانی کوردی.

# دیوانی سەفوەت و چانێك لەژێر سێبەری دارەڕەشدا (١)

□ عومەر مەعروف بەرزنجی □

پێش چەند مانگێك لەمەوبەر کتێبێکی سەوزە پۆشی (١٥٨ لاپەڕەیی بەناوی (دیوانی سەفوەت) کەوتە بەردەستی خوێندەوارانی کورد، ئەم کتێبە بریتی یە لە کۆمەڵە شیعرێکی خوا لێ خۆشبو (مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسوولی دێلێژەیی) و دکتۆر (عیزەدین)ی کوریشی پێشەکی یەکی (٣٨) لاپەڕەیی خستووەتە پاڵ و پەلی بۆرستێك مەسەلەی جۆراو جۆری ئەدەب و رۆشنبیری و مێژوویی و تەنانەت سیاسیش هاویشتووەو زیاد لە پێویست لاپەڕەی رەش کردووەتەوە. جا لەبەر ئەوەی کە لەسەرجەم کتێبەکەداو بەتایبەتی پێشەکی یەکەی بیروڕای نەشیاوو دەلاقەی گەورەی مێژوویی تێ کەوتووە، هەر بۆیە بە پێویستی یەکی ناچاریم زانی کە بە پێی توانست و مەودای لاپەڕەکانی ئەم گۆڤارەئاورێکی رەخنەیی یان لێبدەمەوەو زۆر لایەنی ئەم کتێبە بخەمە بەر تیشکی رەخنەیەکی فرە لایەنی ئەوتۆوە کە تارادەیەك نەك خزمەتی راستی بکات و جێی رەزامەندی خوێندەوارانی ئازیز بێ بەتەنیا بەلکو رێ نومایی یەکی ئەرشیف و رەخنەی کوردی بێ بۆ ئەو نووسەرەی کەجڵەوی سۆزو لە خۆ رازی بوونی بێ سنوور بۆ قەڵەمەکەی شل ئەکات ! چونکە هەر ئەوەندەی وشە کەوتە سەر کاغەز ئیتر مەودای خاوەنێتی فراوان ئەبێت و میللەتیش بۆی هەیە بە هەموو شێوەیەك گفتوگۆی لەسەر بکات، بەتایبەتی نووسینی یەکێکی وەك دکتور

عیزەدین کە ئەگەر لە جێی خۆیدا بۆی ڕاست نەکرێتەوە ئەوا ئەبێتە سەرچاوەو نەوەکانی داهاتوو تەنانەت ئێستاش چەواشە ئەکات.[٢]

١ ـ بەر لە هەموو شت ڕاستی یەك هەیەو زۆربەی خوێندەوارانیش هەستیان پێکردووەو ئەم باسەش شوێنی درکاندنێتی کە دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوول لە کاتێکدا کە پێشەکی یان باسێکی ئەدەبی ئامادە ئەکات و نەخوازەلا ئەگەر بە ئاستەم پەیوەندی بە ناسیاو یان بنەماڵەکەی خۆیەوە هەبێ ئیتر بەتەواوی لە پرۆگرامی زانستی یانە دەر ئەچێت و جڵەوی ختووکەو سۆز هێندە شل ئەکات و بەسەر هاتی لاوەکی تێ ئەترنجێنێ کە هیچ کامیان پەیوەندی یان بەوی تریانەوە نامێنێ و زۆربەیشیان جێی گومانن و لەم سەردەمەیشدا زۆر بەگران بە سەر خوێندەواران دا باز ئەدەن، هەر ئەم کـارە دوور لە زانستی یەش نـووسەری دووچاری چەندەها هەڵەی گەورە کردووەو لە بەرامبەریشدا زیانێکی فرەی بە مێژووی ئەدەب گـەیانـدووە. پێویستیشـە لەوە ئاگـاداربین کـە ڕاستگۆیی لە نووسین و دەربڕین دا سیفە تێکی ڕەزا سووکی هەموو نووسەرێکی کارامــەیەو (ئەندریە جید) لەم بارەیەوە باش بۆ چووە کەوتویەتی (گران ترین کار لە دنیادا ئەوەیە کە نووسەر دڵسۆز بێت لە ئاستی پێنووسەکەی و لێپرسراو بێت لە تۆمار کردن و پێش خستنی دا)[٣] بەڵام دوکتۆری پێشەکی نووس بە هەر مەبـەستێك بێ ! مێژووی ئەدەبی لە گرێژە نەبردووەو ویستویەتی کاروانی ئەدەبیمان بەرەو ئەو جێیە ملبنێ کە خودی مەبەستەکانی خۆی تیا بەدی بهێنێت و هەر بۆیە لەم ڕووەوە کۆمەڵێ هەڵەی لکاندووە بە مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە.[٤]

٢ ـ نووسەر بەواتای خۆی بیری تیژەو لە لاپەڕەکانی زۆر بەرهەم و ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دا بەسەرهاتە وردو درشتەکانی سەرەتای ساڵانی چل ئەگێڕێتەوە لە کاتێکدا کە تەمەنی شەش حەوت ساڵان بووەو لە هەمــوو وتارو بـاسەکـانیدا تێهەڵکێشیان ئەکات کەچی لە مێژووی ژیانی (سەفوەت)ی بارکیدا دووچاری ئاڵۆزی و درشتی یەکی تـەواو بووە ئـەوەتا لە (ل ١)ی دیـوانەکـەدا مێژووی (١٩٠٥)ی بۆلە دایك بوونی باوکی داناوە. بەڵام لە (ل ٤)دا ساڵانی ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧ی بەڕاست زانیوە، سەیریش لەوەدایە لەو نوسخەیەی کە پێشکەشی کاك (ڕەئووف بێگەرد)ی[٥] کردووە دکتۆر هێڵێکی بەسەر (١٩٠٥:ی لاپەڕە (١)دا هێناوەو ساڵی (١٩٠٩)ی لەسەر داناوە. لەلایەکی ترەوە گـەر سەیـری کتێبی (زمان و ئەدەبی کوردی)[٦] پۆلی یەکەمی ناوەندی بکەین کە ساڵی ١٩٧١ لەلایەن دکتۆر عیزەدین و دکتۆر ئیحسان و خوا لێخۆشبو سادق بەهادینەوە دانراوەو بە بێ موناسەبە چیرۆکێکی گوێ ئاگردانی کتێبی (شانۆی ناو ماڵ)ی سـەفوەت لەیەکەم لاپەڕەدا قووتکراوەتەوەو لەوێـدا بە کـورتی مێژووی ژیـانی باوکی

نووسیوەو ساڵی (١٩٠٤)ی بۆدانـاوە. هەر بـۆ ئەم مـەبەستـەیش سەیـری گوڵستانـەکەی (سـەفوەت)م کـرد کە کـردوویەتی بـە کوردیو لەوێـدا ساڵی (١٣٢٤)ی کۆچی بۆ دانراوە، ئیتر تێناگەم ئەو هەموو مێژووە چـینو کامیـان راستن ؟ خۆ یەکێکی وەکوو (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) نـەبووە کـە کەس نەوێری خۆی بکات بە خاوەنیو خوا خوای دیزە بەدەرخۆ نەکردنی تەمـەنو بوونەکەی بێت !! ئایا پێشەکی نووس ئەو هەموو باسو رووداوانەی لە سـەر زوبانی باوکی هێناوەتەوە رۆژێ بۆی رێ نەکەوت بپرسێ (ئەرێ بابەگیان توخوا کەی لە دایكبوویت ؟) جا لێرەدا خوێندەواران ماف ئەوەیان نییە کە لە وتەکانی دکتۆر بەگومان بنو زۆر بە کەمی راستییان تیا بدۆزێتەوە ؟ وا دیاریشە دکتۆر ئەو مێژووەی (١٩٠٩)ی بەلاوە راستە بۆیە لە نوسخە دیارییەکـانـدا چاکی کردووە بەلام لێرەدا ئەکەوێتە هـەڵەیەکی گـەورە ترەوە چـونکە لە (ل ٣٠)ی پێشەکییەکەیدا ساڵی لەدایك بوونی (ن. ئاری) مامی بە (١٩٠٩) داناوە بەم پێیە سەفوەتو براکەی ئەبێ بەسکێك لەدایك بوو بن یان بەری دوو دایك بن ! کەچی لەو لایشەوە لە (ل ٥) دا ئەوەی وتووە کە (ن. ئاری) لە سەفوەت منال تر بووە. خۆگەر ئاورێـك بدەینـەوە بۆ دواوەو سـەیرێکی رۆژنـامەی هـاوکاری ژ (٦٤٢)ی رۆژی ١٩٨٢/٦/١٧ بکەینو لەو باسەی نووسەر ورد ببینەوە کـە سەبارەت بە پیرەمێرد نووسیویەتیو وەك عادەتی خۆیو بە بێ موناسـەبە (ن. ئاری) مامی تێهەڵکێش کردووەو ساڵی (١٩١٠)ی بۆ لەدایك بوونی (ن. ئاری) داناوە. جا لێرەدا رووی دەم ئەکەمە دکتۆرو ئەڵێم کە ئەگەر پێشەکی نـووس لەمەسەلەی بنەماڵەکەی خۆیدا هێندە درشتو دەست کورتو بێ توێشە بەرە بێ ئایا لەباسی کەسانی تردا ئەبێ چۆن بێو بە چ پێوانەیەك (ئـەوانەی مـردنو نامرن)[7] هەڵسەنگێنن ؟ حەز ئەکەم ئەوەیش بڵێم کە من ئەو هەموو پشکنینەم کردووە مەبەستم لەوە نەبووە کە سەفوەت شاعیرێکی هێند بەناوبانگەو نەتەوەی کورد پێویستی بە مێژووی ژیانی هەیە، بەڵکـو مەبـەستی سەرەکیم درشتیو دەست کورتیو هەناسە سواری نووسەرە لە کارەکانیدا.

٣ ـ دکتۆری پێشەکی نووس زۆر لە بارەی (سەفوەت)ی بـاوکییەوە دواوەو قەڵەمەکەی کەلێ لایەنی ژیانی گرتووەتەوە کەچی لەو راستییە ئاگادار نییە کە ناز ناوی سەفوەت تەنیا موڵکی مەلا مستەفای حاجی مەلا رەسوول نییە، بەڵکو کورە گەورەی شاعیری ناو داری کورد (صافی)[8] هێرانی کە ناوی (حاجی مەلا عەلی) یە ناز ناوی (سەفوەت)ی هەبووەو خاوەنی دیوانێکی بەرزو بالایەو بەلام رۆژگار هەلی بۆ نەرەخساندووە تاکوو شیعـرەکانی بـە چاپ بگـەیەنێت تـەنیا مامۆستای خوا لێخۆشبوو (گیوی موکریانی) توانیویەتی پێنج پارچە شیعـری

ڕەنگینی لە چاپی دووەمی دیوانی (صافی)دا بڵاو بکاتەوەو تارادەیەك بە خوێندەوارانی بناسێنی.[9] جا بۆ ئەمانەتی ئەدەبیو نەپسانی زنجیرەی مەبەست پێویست بوو کە دکتۆر مێژووی ئەدەب ئەنووسێتەوە لەم ڕاستی یە ئاگادار بوایە.

٤ - دکتۆر لە (ل ٣٧) داو لە سەر زوبانی باوکی ئەیگێڕێتەوە کە گوایا (سەفوەت) لە گرەوەکەی ساڵی (١٩٢٠)ی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن) دا بەشداری کردووەو ئەڵێ: شیعرەکەی بۆیە دراوەتە دواوە (عەرد یان ئەرد)ی بەکار هێناوەو لێژنەکە بردویانەتەوە بۆ سەر وشەی (أرض)ی عەرەبیو لەوەیش دواوە کە ئەو بەرهەمەی شاعیر دیار نی یە.

لە ڕاستیدا ساڵی (١٩٢٠) (ئێلی بانستەر سۆن) کە لێپرسراوێکی ئینگلیزی بوو لە سلێمانی لە ڕێگەی ڕۆژنامەی (پێشکەوتن)ەوە گرەوێکی ساز کرد بۆ هەر کەسێك کە بتوانێ بابەتێکی جوانو بە کوردی‌یەکی ڕەوان بنووسیو کەمترین وشەی بێگانەی تێدا بێتو بەم چەشنە (٣) پاداش دانراو (١١) نووسەرو شاعیر بەشداری‌یان کردو ناوەکانیان تۆمار کراونو لەدوورو نزیکەوە سێبەری (سەفوەت) دیار نی‌یە.[10] خۆ بە پێی لەدایك بوونی (سەفوەت) بێ کە دکتۆر (١٩٠٩)ی بۆ داناوە ئەبێ تەمەنی (١١) ساڵان بووبێت کە دیارە ئەمەیش زۆر بە گران ئەکاتە ڕاستی، ئەگەر هاتوو ئەم تەمەنەیش بسەلمێنین ئەوا پێویست بوو کە شاعیر دوایی لەو قاوغە تەسکەدا نەمایەوەو شاکاری ناوازەی لە جیهانی شیعردا بخستا بەڕوو. چونکە لە جیهانی شیعرو ئەدەبدا زۆر شاعیری بلیمەت هەڵکەوتوون کە لە تەمەنێکی کەمدا شیعریان وتووە بەڵام بەو پێ‌یە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شیعرەکانیان هەنگاوی گەورەیان بۆ پێشەوە ناوەو بە بەرەو پێش چوونو بەسەر کەوتنێکی ئاسایی بوون بە شاعیرێکی دەرکەوتوو. لە لایەکی ترەوە گوایا لێژنەی گرەوەکە بۆیە شیعرەکەی (سەفوەت) یان داوەتە دواوە چونکە وشەی (عەرد)ی بەکار هێناوەو بردویانەتەوە سەر وشەی (أرض)ی عەرەبی، دیارە ئەمەیان هەر زوو لە خڕکە ئەچێو بیانوویەکە نەمەیوە چونکە پارچە شیعرەکەی شێخ نووری شێخ سالح بەناو نیشانی (جووتو گا شتێکی چاکە)و پلەی یەکەمی وەرگرت جگە لەوەی کە وشەی تری تیایە چەند جارێك وشەی (عەرز) و (أرض)ی بەکار هێناوەو جێی ڕەخنەیش نەبووە، سەرەڕای ئەوەیش وشەی (عەرد) تەکرید کراوەو مافی عەرەبی بەسەرەوە نەماوە. لەم خاڵەدا حەز ئەکەم ئەوەیش بڵێم گەر سەفوەت باسی ئەو گرەوەی بۆ (عیزەدین)ی کوڕی کردووە ئەی بۆ ناوبراو لە کتێبەکەیدا کە بە ناونیشانی (الواقعية في الادب الكردي)[11] یەو بڕوانامەی (کاندیدات)ی لەسەر وەرگرتووە سەر تا پا مێژووی ئەو گرەوەی

شێواندووەو بە هەڵەو پرزە براوی لێ‌ی دواوە.[12] ئەوەتا دکتۆر لەو کتێبەیدا وای نیشانداوە کە گرەوەکە لە ساڵی (١٩٢٥) دا بووەو (جەمیل سائیب)یش بە چیرۆکی لە خەوما پلەی یەکەمی وەرگرتووە. کە لەراستیدا ئەم گرەوە ساڵی (١٩٢٠) ساز کراوەو (شێخ نووری شێخ ساڵح) پلەی یەکەمی وەرگرتووەو (مستەفا سائیب) بە پەخشانی (بۆ چرووك) و (جەمیل سائیب) بە پەخشانی (رۆژەوە بوونێك) پلەی دووەم وسێ‌یەمیان وەرگرتووەو چیرۆکی لەخەوما چەند ساڵێك دوای ئەو مێژووە بەزنجیرە لە ژمارەکانی (ژیانەوەو ژیان)دا[13] بڵاو کراوەتەوەو پەیوەندی بەو کارەی رۆژنامەی (پێشکەوتن)ەوە نەبووە. دیارە ئەمەیش خەوشێکی گەورەیەو بەتەختی تەوێڵی کارەکەی دکتۆرەوە لکاوە. باس کردنی ئەو گرەوەم وەك ئەو بە سەرهاتە دێتە پێش چاو کە بە ناوی (سەفوەت) ەوە لە پێشەکی (گوڵستان)[14]ەکەیدا وتراوە کە گوایا سەفوەت لەکاتی جەنگی دووەمی جیهانی دا بۆماوەی (٣) چارەك شەڕە شیعری لەگەڵ شاعیری بلیمەت (مەلا حەمدون) دا کردووە، لە کاتێکدا کە (حەمدون) ساڵی ١٩١٧ کۆچی دوایی کردووەو (سەفوەت) یش بە پێ‌ی زانیاری‌یەکانی ناو دیوانەکەی لەو کاتەدا تەمەنی (حەوت) ساڵان بووەو بەو منالی‌یە پێش چوونە حوجرە چووەتە جەنگی شیعری (حەمدون)ەوە. ئەو (حەمدون)ەی کە زانای کورد (شێخ محەمەدی خاڵ) لە بارەیەوە وتویەتی (ئەم کوێری ئێمە یە ئەگەر هەزار یەکێکی کوێری خەڵقی دەست مایەو ناونیشانی ببوایە ئەبوو بە خواوەندی هەموو کوێرانی سەر زەوی)[15] لێرەدا ئەڵێم ئەگەر لەو (٣) چارەکە سەرو مڕ چارەکێکی بەر سەفوەت کەوتبێ ئەبێ لە (٣٠٠) هەتا (٥٠٠) بەیت شیعری کلاسی کوردی‌و عەرەبی‌و فارسی لە بەر بوو بێت. واتە منالێکی (حەوت) ساڵان (٤٠٠) بەیت شیعر گوڵبژێر بکات دژی (بافلوف)ی مەڕ (عیزەدین) و (فروێد)ی کەسانی ترەو هیچ فەرهەنگی جێ‌ی ناکاتەوەو تەنانەت ئەم بیروڕایە لە شاخی (کەڵەوێ)[16] سەخت ترە. نەك هەر ئەمە بەڵکو دکتۆر لە کتێبە قوتابخانەیەکانیشدا جلەوی سۆزو نەگونجانی شل کردووەو ئەوەتا زوربەمان ئاگادارین لە ساڵی (١٩٣٠) بە دواوە لە سەر دەستی (شێخ حسین) دا بە ناونیشانی (ژیانی ئینسان) دەست کراوە بە ئامادە کردن‌و چاپ کردنی تەفسیری قورئانی پیرۆزو تا ئەمرۆیش کەسانی وەك (شێخ محەمەدی خاڵ‌و مەلا محەمەدی کوێی‌و مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس‌و عوسمان عەبدولعەزیز محەمەدو کامەران بەدرخان‌و مەحمودی حاجی ئەحمەد)[17] وچەندانی ترەوە بە دەیان بەرگ‌و شێوەی جیاواز تەفسیریان بە چاپ گەیاندووەو گەیشتوونەتە چەند هەزار لاپەرەی چاپکراو کەچی دکتۆر لە کتێبی (زمان‌و ئەدەبی کوردی)[18] پۆلی شەشەمی ئامادەیی‌دا کە بەشی خوێندنەوەو ئەدەبی

خۆی نووسیویەتی چاوی سەرنجی ئەو هەموو بەرگە ئەستوورانەی تەفسیری چاپکراوی نەبینیوەو لە (ل ٢٤٨)دا ئیشارەتی داوە کە گوایا قورئانی پیرۆزیش بە کوردی تەفسیر کراوە وەکو تەفسیری (سەفوەت) کە تەنها دەنگی هەیەو رەنگی نییە، تائێستاش یەکەم جارە لە کتێبی قوتابخانەدا چاپکراو پشت گوێ بخرێو پەنجە بۆ (دەستنووس) رابکێشرێت، لە لایەکی ترەوە ئەوەی بەلامەوە سەیرە کە ئایا ئەم پێ داگرتنەی دکتۆر لەمەڕ تەفسیرو ئەم بابەتانەدا تاچەند خزمەتی فیکری خۆی ئەکەن وگوڕ ئەدەنە بەر ڕەوتی مێژووی کۆمەلایەتیو چۆن لەگەڵ فیکری خۆیدا جوتیان ئەکات.

٥ ـ دکتۆر لە پێشەکییەکەیدا چەندان قسەی تێهەڵکێش کردووەو هیچ کامیان توخنی واقیع ناکەونو تێناگەم ئەم دەست هەڵبەستانە چی ئەگەیەننو لە چ کانیاوێك دەم تەڕ ئەکەن ؟ ئەوەتا لە (ل ٩)دا جارێك بە ئینگلیزی زانو لە (ل ٣٣)دا وتویەتی کە هاتو چۆی (رەفیق حلیمی) کردووە بۆ مەسەلەی فەرەنسی زانین. جا نازانم ئەمەیان پێش چوونە (لوبنان)ی بووە یان دوایی چونکە دکتۆر لە (ل ٨)دا وتویەتی کە هاتیشەوە بە فەرەنسی ئەدواو کۆمەڵێك کتێبو فەرهەنگی لەگەڵ خۆیدا هێناو بوو، جا گەر ئەو توانیبێتی بە فەرەنسی بدوێ چ کارێکی بە (رەفیق حلیمی) بووە ؟ هەر لە (ل ٣٣) شدا وتویەتی کە (رەفیق حلیمی) سەفوەتی بە شاعیری باش داناوەو سەرچاوەکەیشی کتێبی (شیعرو ئەدەبیاتی کوردی)[١٩] یە. لەراستیدا نووسەر لە سەرەتای ئەو کتێبەیدا کە ساڵی ١٩٥٦ چاپی کردووەو بەرگی دووەمینی لەوە دواوە کە نەتەوەی کورد شاعیری زۆرەو بێچکە لەو شاعیرانەی لە کتێبەکەدا باس کراون شاعیرانی تریش هەنو کۆمەڵێکی رێز کردووە وەکوو (مارف خەزنەدارو مەنگوریو توفیق وردیو هەوریو سەفوەت)و گەلێکی تر جا گەر دکتۆر رازی ئەبێ مارف خەزنەدار بە (شاعیر)ی چاك دابنێین ئەوا رایەکەی رەفیق حیلمی سەبارەت (سەفوەت) وەر ئەگرین. لێرەدا ئەڵێم مەرجیش نییە کە هەموو بۆچوونێکی رەفیق حیلمی بەخاڵو کۆماوە بقەبڵێنین، ئەوەیش لە یاد نەکەین کە دوای دەرچوونی کتێبەکە (مەنگوری)[٢٠] بەو ناو هێنانە رازی نەبوو.

٦ ـ پێشەکی نووس لە (ل ٣٢) دا سەبارەت بەو مزگەوتەی کە باوکی پێش نوێژی تیا ئەکردو کاروباری ئیسلامی تیا بەڕێوە ئەبرد لەوە دواوە کە لە بنەڕەتدا مزگەوتی حاجی مەلا رەسوولی باپیرێتیو بەهەڵە بە مزگەوتی (باشچاوەش) ناوی زراوە کە چی لە کاتێکدا گەڕامەوە بۆ کتێبی (هۆنراوەی کوردی لە دوڕی بوردی)[٢١] کە ساڵی ١٩٣٥ چاپکراوەو سەفوەت نووسیویەتی (مودەڕیسی

مزگەوتی باشچاوەش لە سلیمانی مەلا مستەفا سەفوەت) جا تێناگەم بۆ ئەم مەبەستە دکتۆر شارەزایەیان باوکی کە لێرەدا پەندێکی پیرەمیرد جێی خۆیەتی:

## مودەعی وازی لە هەق هێناوە
## شایەت بۆ دیفاع هەڵکێشاوە

شتێکی ئاسایی‌یە مزگەوت ناوی (باشچاوەشس) بێت و کەس لە سەر ناو تووشی چوورتم و نەنگی نەهاتووەو لەو ولاتەی کە پێشەکی نووس بڕوانامەی (کاندیدات)ی تیا وەرگرتووە ئێستاش زۆر ناوی ئیسلامی ماوەو کەسیش قەدەغەی ناکات، خۆ گەر بەو پێ‌یە ببێت ئەبوایە ناوی مزگەوتی (پاشا) لە هەڵەبجە لە دوای (٩٥٨)ەوە بکرایە بە کۆماری !.

٧ ـ دکتۆر لەم پێشەکی‌یەدا بە بێ تێرامان و هەست بە لێپرسینەوە کۆمەڵێ قسەی شەن و کەو نەکراوی خستووەتە بەر چاو، لە (ل ١٢)دا ئەڵێ (لە سالانی پەنجادا هەندێك جار لەگەڵ ئاشتی خوازاندا ناو و ئیمزای هەبوو ئەگەر سەیری رۆژنامەکانی سالانی ١٩٥٨ ـ ١٩٥٩ بکەین دیسان ناو و ئیمزای لەناو پشتگرانی بەرەی نیشتمانیدا دەبینین) لێرەدا لەجێی خۆیدایەتی کە بڵێین گرنگ ئەنجام و سەقام گیری هەڵوێست و باوەڕو نیهادی دەروونە و لەهەمان کاتدا ئەپرسین کە ئایا بەرنامەی لێکۆڵینەوەی زانستی یانە بەم جۆرەیە ؟ چونکە کام رۆژنامەو کام ژمارە ؟ خوێندەواران بی‌یانەوێ بۆ راستی بگەڕێن ئەبێ سەرجەم رۆژنامە کوردی و عەرەبی‌یەکانی عیراق بپشکنن بەلام دیارە مەسەلەکە هەر قسەیەو بۆیە نەتوانراوە پەنجە بۆ سەرچاوەکان رابکێشرێت و بۆ ئەم مەبەستەیش هانا ئەبەمە بەر بیرەوەری فەقێ و پیاوە ئایینی‌یەکانی سلێمانی ! یان لە (ل ٣٨)دا دەربارەی شێعرەکانی سەفوەت ئەوەی کە (رەنگە لە ژمارەکانی ژین و ژیاندا شیعری بلاوکراوەی هەبێت بەلام بە داخەوە نەمانتوانی هەموو ئەو ژمارانە بگەڕێین) بەلام هەق وابوو دکتۆر ئەمەی نەنووسیایە چونکە لە رۆژی ٨/١١/١٩٨٤ دا لە کتێبخانەی سلێمانی لە لای مامۆستا (مەحموود توفیق خەزنەدار)ەوە وتویەتی کە لە (لەندەن سەیری کتێبخانەکەی ئەدمۆنسم کرد کە پێشکەشی کردووە بە ئۆکسفوردو هەموو ژمارەکانی (ژیانەوە) و (ژیان)م بینی و بەرهەمەکانی (عەبدولواحید نوری)م تیا دۆزیوەتەوە)، باشە گەر شیعری باوکی بلاوکرابێتەوە دکتۆر پێی نەئەزانی و بە تاسووق و ئەڵهاوە بۆی نەگەراوە ؟ دکتۆرێك کە شیعری کەسانی تری قارس کردبێ و ترنجانبێتی دیوانەکەی باوکی‌یەوە وەك لەمەودوا لێی ئەدوێین، ئایا بۆ شیعرە بلاوکراوەکانی کێومالێ بۆ

ناکات و بەزمان و قەڵەم لاپەڕەکانی هەڵناداتەوە ؟!! نەك هەر ئەمەیش بەڵکو لە (ل ٣٥) دا ئەوەی درکاندووە کە حاجی مەلا رەسوول جێ نشینی حاجی کاك ئەحمەد بووە) و بۆ ئەمەیان لێکۆڵینەوەی فراوان ئامادەیە و ئومیدەوارم بەزوویی رێگای بڵاوکردنەوە بگرێتە بەر.

٨ ـ چاو خشاندنێك بە دیوانی (سەفوەت) داو ناو تووکردنی سەلیقەو بەهرەو پێشکەوتنی شیعرەکان بە چاوێکی نرخ برین ئەگەینە ئەو ڕایەی کە نەتـەوەی کورد لەبەرە بەیانی مێژووەوە ژمارەیەکی زۆری لەم شاعیـرانە هـەیەو بگـرە زوربەی مەلاکانی کوردستان کۆمەڵە شیعریان هەیە گەر لەمانە بەرزتر نـەبن کەمترنین و (بەڵام چونکە نە خۆیان شوانێك و نەباخەکەیان باخەوانێکی بووە بە خۆیان و ئەدەبیانەوە پایزی ناکـامی بەهـاری ژینیانی لەریشـە دەرهێناوە) و[٢٢] هەل و مەرجی تایبیەتی یان بۆ نەرەخساوە تا بەرهەمەکانیان رێ چاپخانە بگرنە بەرو تەنانەت لە (مێژووی ئەدەبی کوردی) داناوی (٢١٢) شاعیری کورد تۆمار کراوە جگە لە رۆژنامەو گۆڤارو سەرچاوەکـانـی تر. کـەچی پێشەکی نـووس و ئامادەکەری دیوانەکە لەم راستی یە رووی وەرچەرخاندووەو بیروڕای سەیری سەبارەت شیعرەکان هەڵڕشتووە، بۆنموونە لە (ل ٤٦) داو بۆ شیعری (ماسی) کە لە بنـەرەتدا شیعرێکی ئـاسایی یـەو تەنـانەت نـاچێتە ریـزی شیعـرەکـانی (سەفوەت) خۆیشی یەوە بەڵام دکتۆر چـەند دێـڕێکی لەسەر نـووسیوەو رای گەیاندووە کە بێ کەس و بەختیار زیوەر لەکاتی خوێندنەوەی شیعرەکەدا چەپڵەی ئافەرین یان بۆ لێداوەو لەو سەردەمەیشدا واتا ساڵی (١٩٤٣) تەمەنی پێشەکی نووس (٨) ساڵان بووە،[٢٣] دکتۆر بەمەیشەوە نەوەستاوەو لە سنووری بڤە نزیك بووەتەوەو وتویەتی (جارێك بیری ئەم شیعرانەم بۆ جەواهیری مەزن باس کرد دەیوت زۆر تازەیە... نوێگەری یە) جارێ پێش هەموو شتێك ئـەوی ئاگـاداری بیروڕای جەواهیری بێ سەبارەت شیعرو قـۆناخـەکانی شیعـر هەر زوو بـەو راستی یە ئەگات کە ناوبراو تەنانەت نکولی لە بەهرەو توانا و سەلیقەی (بەیاتی)· ئەکات و لەو مشت و مڕە ئەدەبی یەش ئاگادارین کە لە نێوانیاندا رووی داو ئیتر نوێگەری چی وبۆ قسە بەدەم شاعیرێکی گەورەوە بکرێ کە لەزمانی کوردی بێ ئاگایە ؟ لێرەشدا ئەڵێم بـۆچی دکتۆر بـاسی نالی و مـەولەوی و هێمن و وەفایی و هەردی بۆ جەواهیری نەکردووەو ئایا لەو هەموو گەورانەدا باسی (سەفـوەت) کـردن بەڵگـەی چی یە ؟ ئـایا نـوێنـەری ئـەدەبی کـوردی بـەدەسمـایـەی (سەفوەت) ەوە کورد بە جیهانی رۆشنبیری ئەناسێنێ ؟ ئەمە لەکاتێکدا کە لە (الواقعية في الادب الكردي) یـە کەدا پـلار دەگرێتـە مەولەوی و بـەو هەمـوو گەورەیی یەوە بە نازانستانە لێ ی ئەدوێ.[٢٤] لە لایەکی ترەوە کاتێ گەڕامەوە سەر

ئەو ژمارەیەی گەلاوێژو بەراوردم کرد لەگەڵ شیعری ناو دیوانەکەدا بینیم جیاوازی گەورە لە نێوانیاندا هەیەو دەستکاری کراوەو ئیشارەتیش بەم گۆڕینە نەکراوە، ئەمە جگە لەوەی دکتۆر بە هەڵە ژمارەی گۆڤارەکەی نووسیوە کە لە راستیدا ژمارە (١١)ی ساڵی (٤)ی گۆڤاری گەلاوێژە.

٩ ـ لەم دیوانەدا پارچە شیعر هەیە کە زۆر دێریان وەك خۆی یان بە بیرازکراوی لە شاعیرانی ترەوە وەرگیراون‌و تێکەڵ بە شیعرەکان کراون.[٢٥] لێرەدا دکتۆر ئاگای لەم شتانەیەو کەچی پەنجەی لەئاست ئەم وەرگرتن‌و دەست بە سەرا گرتنەی باوکی بەرز نەکردووەتەوە ! بەلام بۆ حیسابی خۆی بەئاگاو زرنگە، هەر بۆ نموونە پرۆگرام‌و رێ رەوەکەی خۆی لە پێشەکی کتێبی (شیرین‌و خەسرەو) دا ناسی‌یەوەو دنیای شڵەژاند کە گوایا (محەمەدی مەلا کەریم) لێ‌ی وەرگرتووەو هەر ئەم مەسەلەیەو چەند شتێکی تر بوو کە بوونە هەوێنی ئەو نووسینەی گۆڤاری (الثقافة)[٢٦] من لێرەدا ئەمەم بەلاوە گرنگ نی‌یەو راست‌و چەوتی بیرو رایەکەی دکتۆر لە مەر ئەو کتێبە ئاگادار نیم، گرنگ ئەوەیە بۆ خەڵکی قەپانەکەی بچووکترین شت ئەخوێنێتەو بۆ خۆیشی لێکدانەوەیەکی جیاوازی هەیە.

ئەوەتا لە (ل ٤٠) داو شیعری یەکەمی دیوانەکە ئەڵێ:

خەیاڵی عەشقی هێند گەرمە لەسەرما
لە زستانا نی‌یە باکم لە سەرما

هەر تەواو لەو دێرەی (حەمدی) یەوە وەرگیراوە کە ئەڵێ:

خەیاڵی عەشقی رووتە وا لە سەرما
بە رووتی بۆیە نیمە باکی سەرما[٢٧].

١٠ ـ لە (ل ٥٨) داو بۆ شیعری (دولبەرا) کوت‌و مت‌و شەو بیرو شێوەو ئاهەنگی سەرجەم شیعرەکە لە بەرهەمێکی (ئەحمەدی کۆر) ەوە وەرگیراوە کە وتویەتی:

دولبەرا دایم دەنالم دەم بەدەم شام‌و سەحەر
جارێ ناپرسی لە حالم چاو عوقابی خۆش‌خەبەر

سەفوەتیش وتویەتی:

**دولبەرا تاکەی بنالّم دەم بە دەم هەر سوبح وشام**

**بۆچی ناپرسی لە حالّم خۆشەویستی خۆش کەلام**

هەرچەندە دکتۆر لە پەراوێزداو بۆ شوێنەونی ئیشارەتێکی بچووکی بۆ ئەم مەسەلەیە کردووەو بەلاّم تەنها ئەوەی دەرکاندووە کە هونەرە شیعری یەکەی چووەتەوە سەر (ئەحمەدی کوڕ).

١١ ـ لە (ل ٧٤)دا شیعرێك بلاّو کراوەتەوە بەلاّم لە راستیدا هەر دێڕەی بیرو زادەی شاعیرێکەو لە ئەنجامدا ئەم شیعرەی لێ دروست بووە، واتا سەرجەم چەشنی دێوجامەیەو هەر بەیتەی دنگو ئالّو والاّی شاعیرێکی ترەو ئەوەتا لە دێڕی دووەمدا ئەڵێ:

**شەو رۆژە لەبەر بەرقی ئەلەترێكو چراخان**

**کەئەمە هەر تەواو لە شیعرەکەی (مەلا حەمدون) ەوەم** که وتویەتی:

**شەو رۆژە لەبەر بەرقی قلیچو رمو سونی**

لە دێڕی چوارەمیشدا وتویەتی:

**ئەم گەردنە بێ گەردە کەوەك جامی بلوورە**

بە خوێندنەوەی یەکسەر دێڕێکی (هەردی) مان بیر ئەکەوێتەوە:

**ئەو گەردنە بێ گەردە کە وەك تەختی بلوورە**[٢٨]

١٢ ـ لە (ل ٩٤)دا چوار ینێکی بێخود بلاّو کراوەتەوەو گوایا بەرهەمی (سەفوەت)ەو بەهەڵە لە دیوانی (بێخود)دا چاپکراوە بەلاّم بەپێی ئەو

سەرچاوەو دەستنووسە دەوڵەمەندانەی کە ئێستە لەبەر دەستدان بەرهەمی بێخودەو لە جێی خۆیدایەتی کە بخرێتەوە دیوانەکەی مەلا مەحموودی بێخودەوە.

١٣ ـ شێخ رەزای تاڵەبانی (١٨٣٥ ـ ١٩٠٩) ئەو شاعیرە بزورگەیە کە لە باتی تیغی دەبان تیغی زوبانی هەبووەو دەیان کەس لە ترسی هێرشە شیعرییەکانی زارەترەك بوون کە چی دکتۆر شیعرێکی ئەم جوامێرەی بە پەڕو باڵەوە داڵ قوت کردووەو خزاندوویەتێ دیوانەکەی باوکییەوە، ئەوەتا لە (ل ١١٠)ی دیوانەکەدا نووسراوە:

**سوئالم کرد کە چـین بەر بـوونەوە، ئـەو نەحسی قبـرسچمە**

**دوو لفکـەی دا بـەیـەکدا کـاکـە شێـخ قـادر وتی لچمە**

کاتێ کە ئەگەڕێینەوە دوو تویی دەستنووسە کۆنەکان ئەبینین کە زادەی بیری شێخ رەزایەو هەجوی شێخ مەحموودە لچەی کردووەو ئەڵێ:

**تعجب گـرتمـی لەوەی بـەربـوو لەو نـەحسی قـیرسچمە**

**دوو لێفـەی دا بـەیـەکـدا خـالە مـەحمـوو وتـی لچمە**[٢٩]

١٤ ـ لە (ل ١١٠)دا نیوە دێڕێکی (مەحوی) نووسراوەو بۆ نیوەکەی تری وتراوە کە تێهەڵکێشی (سەفوەت)ە بەڵام وانییەو زادەی بیری مامۆستا نـەجمەدین مەلایە.[٣٠] لە (ل ١٤١) شدا چوارینێکی عەرەبی نیشاندراوەو خراوەتە خانەی شیعرەکانی (سەفوەت)ەوە کە چی لەبەرهەمەکانی (موفتی زەهاوی)یە.[٣١]

١٥ ـ ئەمانە بوون بە نووکە قەڵەمێکی درشت هەندێ لە ناتەواوییەکانی دیوانی سەفوەت و پێشەکییەکەی، وە ئەگەر دکتۆر بە چاوی داهێنانەوە بڕوانێتە هەندێ بـەرهەمی دواکـەوتوو حـەز ئەکـەم ئەوە بـزانێ کە داهێنـان بەسـتـراوە بـە پێویستییەوەو هەر دووکێشیان دیاردەی لایەنێکن لە لایەنەکـانی فەلسـەفە، تاکو ئەو داهێنانە باشترو رەساتر خزمەتی راستی فەلسەفی بکات و پتر گۆڕینی واقیعی مێشکی مرۆڤ بگرێتە خۆ ئەوا زووتر گـۆی نەمـری دەباتـەوە، بەڵام داهێنانێك کە پێویستییەکی رێکەوت ئاساو نیـوە چڵ دەربـڕێت ولە مەیـدانی فەلسەفەی پێشکەوتن خوازی لابدات ئەوە نەك داهێنان نییە بە تەنیا بەڵکو گا بەردێکیشەو لەمەیدانی فیکردا قووت کراوەتەوە، رەخنەی رەسەنیش لەمەیدانی پیـرۆزی خۆیـدا داهێنانـە بەڵام چ رەخنـەیەك ؟ ئـەوەی کـە بتـوانێ بیـرو

راگەندەلەکان هەڵتەکێنێ نەك دەستی خۆش وتن و هەڵدان بگری بەسنگەوە بۆ بەرهەمێ کە دژی مەیدانە فراوانەکانی بیروڕای پێشکەوتن خوازی یە. ئەدەب کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یە پێویستە لەسەر بناخەیەکی دروست بنیان بنرێ و لاپەڕە رووناکەکان بگرێتەوە.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:

١ ـ مەبەست لەو دارە رەشەیە کە لە باخچەکەی مزگەوتی (باشچاوەش) بووەو لە زۆر شوێنی دیوانەکەدا ناوی هاتووە.
٢ ـ ئەوەتا (مصلح مصطفی جەلالی) نووسەری کتێبی (شێخ نووری ـ دەنگی رەسەنی شیعر) لە (ل ١٦٠)دا بۆ گرەوەکەی رۆژنامەی (پێشکەوتن) ساڵی ١٩٢٥ی دەستنیشان کردووەو سەرچاوەکەشی (ل ٢٠٦)ی (الواقعیة في الادب الکردي) دکتۆر عیزەدین مستەفایە، دیارە ساڵی (١٩٢٠) راستە وەك لە دووتویی ئەم نووسراوەدا باس کراوە. خۆگەر ئەو کتێبە نەکرایە بە سەرچاوە بێگومان ئەو هەڵەیە رووی نەئەدا.
٣ ـ ئەندریە جید (١٨٦٩ ـ ١٩٥١) بۆئەم وتەیە بڕوانە گۆڤاری بەیان ژ ٤ س ١٩٧٠ (ل ٣٤).
٤ ـ دکتۆر عیزەدین کە پێشەکی یان باسێکی ئەدەبی ئەنووسێ هێند باسی لاوەکی تێ ئەترنجێنی کە زنجیرەی مەبەستی لە دەست ئەبچڕێ و هیچ بایەخێك بە پرۆگرامی زانستی نادات. زوربەی ئەو پێشەکی یانەی نووسیونی یان هێرش و پلار تێ گرتنی بێ هۆیە، یان پیا هەڵدانی کەسانێکە کە مەبەستێتی، یەکێك لەو قسە ساردو سڕانەی کە لە پێشەکی کتێبێکدا خستوونی یە بەر چاو ئەو هێرشەیەتی بۆ (هێمن)ی مرۆڤ و شاعیرو کۆڵنەدەر، بێ ئەوەی لەو راستی یە گەیشتبێ کە (هێمن) هاوشانی هەموو کەسێك نی یەو لە خۆیدا هەڵۆیەکی بەرزە فرەو قوتیلەی داگیر ساوی ناو کەپرو ماڵەکانی هەموو زەحمەت کێشە دڵسۆزەکانی ئەم کوردستانەیە. (بۆ ئەمەش بڕوانە (پێشەکی عەمەری جەلالی ـ ١٩٨٢).
٥ ـ سوپاسی کاك (رەئووف بێگەرد) ئەکەم کە ئەو نوسخە دیاری یەی دامێ و لە هەمان کات دا سەرنجی بۆ ئەو راستکردنەوەیە راکێشام.
٦ ـ زمان و ئەدەبی کوردی ـ چاپی یەکەم ـ چاپخانەی ئەسعەد ـ ١٩٧١ (ل ٢٣) هەر لەو کتێبە داو لە (ل ١٣٤)دا شیعرێکی (عبدالقادر ئەحمەد)ی ئامۆزای لەگەڵ کورتە مێژوویەکی ژیانی بڵاو کراوەتەوە. ئەوەی جێی سەرنج بێ لە کاتی خۆیدا دکتۆر (محەمەد نوری عارف) رەخنەیەکی بەجێی لەسەر ئەم کتێبە نووسی بەلام بەبێ ئەوەی پەنجە بۆ ئەم خاڵانەی ئێمە رابکێشێ، بۆ ئەم رەخنەیەش بڕوانە رۆژی کوردستان (ژ ٣ ـ ٤) ئەیلولی ١٩٧١ (ل ٤٢) لە دواییشدا دکتۆر عیزەدین وەلامێکی پڕ لە هێرشی دایەوە، بڕوانە هەمان گۆڤار (ژ ٧) مارتی ١٩٧٢ (ل ٤٩).

٧ ـ ئەوانەی (مردن و نامرن) گۆشەیەکی دکتۆرە ناو بەناو لە هاوکارییدا بڵاویان ئەکاتەوەو لە سەرجەم ئەو باسانەدا کە تا ئێستا رووناکی یان بینیوە کۆمەڵێ سەرنج و پیاچوونەوەم هەیەو ئاواتە خوازم بەزوویی بڵاویان بکەمەوە.

٨ ـ (صافی) ناز ناوی کاکه مستەفای هێرانی‌یە. ساڵی ١٨٧٣ی زایینی لەدایك بووەو لە ساڵی ١٩٤١دا کۆچی دوایی کردووە، دیوانەکەی بۆ جاری یەکەم ساڵی ١٩٥٣ لەلایەن (موحسین دزەیی)یەوە چاپکراوە، بۆ دووەم جاریش بە شێوەیەکی فراوانتر ساڵی ١٩٧٣ گیو موکریانی بە چاپی گەیاند.
٩ ـ بڕوانە دیوانی صافی ـ ١٩٧٣ چاپخانەی کوردستان (ل ٨٨).

١٠ ـ ئەوانەی بەشداری گرەوەکەیان کرد ئەمانە بوون (شێخ نووری شێخ سالح، مستەفا سائیب، جەمیل سائیب، مەلا کەریمی ناتیق، ئاورەحمان بەگ، شێخ نووری شێخ بابا عەلی، محەمەد عبدولرحمان، ئەسیری حاجی سعید زادەعەبدو لرەحمان، مەلا حەسەنی قازی، هادی سائیب) ئەم ناوانەیش لە کاتی خۆیدا لە ماموستا (نەجمەدین مەلا) م وەرگرتو ساڵی ١٩٧٩ بە ئاگاداری نووسەرو دڵسۆز خواڵی خۆشبوو عەبدوڵلا جەوهەر پرسیارم لە خوا لێ خۆشبوو مستەفا سائیب کردو ئەویش ناوەکانی سەلماند.
١١ ـ الواقعیة فی الادب الکردي ـ ١٩٦٦ ص ٢٠٦.
١٢ ـ کتێبی ناو براوستێك هەڵەی مێژوویی و ئەدەبی گرتووەتە خۆ، باسێکی فراوانم ئامادەیە سەبارەت بەم کتێبەو دوای بە دوای بڵاوکردنەوەی ئەم نووسینەم ئەویش رێگەی چاپ ئەگرێتە بەر.
١٣ ـ بەداخەوە زۆر لەو کەسانەی کە دەربارەی چیرۆك ئەنووسن و تەنانەت بیبلیوگرافیا ئامادە ئەکەن ئێستاش لەوە ئاگادار نین کە رۆژنامە کوردی‌یەکان لە دایك بووی چ سەردەمێکن، ئەوەتا (حسین عارف) لە باسێکی‌دا بەزمانی عەرەبی دەربارەی چیرۆکی کوردی بە هەموو لە خۆ رازی بوونێکەوە وتویەتی کە رۆژنامەی ژیان دەرچووەو ئینجا رۆژنامەی ژیانەوە جێگەی گرتەوە کە دیارە پێچەوانەکەی راستە. بۆ ئەمەیش بڕوانە مجلة الاقلام ـ العدد ٣،٢ شباط واذار ١٩٨٤ ص ١٣٥. هەر وەها بڕوانە ـ عشرون قصة کردیه. من منشورات کاروان ١٩٨٥ ص ٢٠٨.
١٤ ـ بڕوانە گوڵستان ـ مستەفا سەفوەت ـ بەغدا ١٩٦٨ (ل ٤).
١٥ ـ رۆژی نوێ ژ ٨ س ١ تشرینی دووەمی ١٩٦٠ هەروەها بڕوانە (ناڵەی دەروون) ١٩٨٤ (ل ٢٠).
١٦ ـ کەڵەوێ شاخێکی سەخت و کورە بەرامبەر گوندی دیلێژەیە.
١٧ ـ لە کتێبی (گەنجینەی فەرهەنگ و زانست) کە لە دانراوەکانی (محەمەد ساڵح ئیبراهیم)ەوە ناز ناوی (شەپۆل)ی هەیەو بریتی‌یە لە (٨٨٦) لاپەرە لە باسی کامەران بەدرخان دا پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە تەفسیری هەیەو چاپکراوە.
١٨ ـ ئەو شەش کتێبەی کە بۆ پۆلەکانی ناوەندی و ئامادەیی دانراون بەشی ئەدەبەکەیان پڕن لە هەڵەو کەم و کووڕی، هیوادارم بەرەخنەیەکی دروست کارێکی پێویست بە جێ بهێنم.
١٩ ـ دکتۆر لە ئەتروحەکەیدا بە هەڵەی مێژووی چاپکردنی ئەم کتێبەی نووسیوەو وای داناوە کە لە چاپکراوەکانی ساڵی (١٩٥٥)ە بەلام ساڵی ١٩٥٦ چاپکراوە. بڕوانە الواقعیة فی الادب الکردي ـ ١٩٦٦ ص ٢٤.

٢٠ ـ بڕوانە گۆڤاری شەفەق ـ ژ ٤ نیسانی ١٩٥٨.
٢١ ـ بڕوانە (هۆنراوەی کوردی لە دوڕی بوردی) سلیمانی ـ چاپخانەی ژیان ـ ١٩٣٥.

٢٢ ـ مێژووی ئەدەبی کوردی ـ چاپی یەکەم ـ ١٩٥٢ (ل ٥٣٥).
٢٣ ـ دکتۆر بە پێی واتای خۆی لە دایکبووی ساڵی (١٩٣٥)ە بۆ ئەمەش بڕوانە ـ الواقعية في الادب الكردي ـ هەروەها بڕوانە ـ وعي العمال ـ العدد ٥٤٨ كانون الثاني ١٩٨٠.
٢٤ ـ لەم بارەیەوە مامۆستای رەخنەگر (رەئووف عوسمان) بە ناونیشانی (عالم مولوی الرومانسي والواقعية المطلوبة) بە زمانی عەرەبی بیرۆچکەی دکتۆری رەت کردووەتەوە. بڕوانە (جريدة العراق) العدد ٢١٨٣ في ١٩٨٣/٤/٤.
٢٥ ـ (کاك محەمەدی مەلا کەریم) یش شیعرێکی (شێخ مە حموودی مەزن)ی خستووەتە چاپی دووەمی دیوانەکەی (بێکەس)ەوە بڕوانە دیوانی بێکەس ـ چاپی دووەم ـ ١٩٨٠ (ل ٢١٥).
٢٦ ـ بڕوانە الثقافة ـ العدد (٤ ـ نيسان ١٩٧٦).
٢٧ ـ دیوانی حەمدی ـ چاپی یەکەم ـ ١٩٥٧ (ل ١٦٢).
٢٨ ـ ژین ژ ٥٧٧ ـ (٢٤ی ئابی ١٩٣٩).
٢٩ ـ ئەم شیعرەی شێخ رەزا لە چەند دەستنووسێکدا هەیەو لام پارێزراون. لەم ماوەیەشدا برای دڵسۆز کاك (ئەحمەد حسین بێداد) لەگەڵ چەند دێرە شیعرێکی تردا بۆی هێنام.
٣٠ ـ لە سەرەتای ساڵانی (١٩٦٠)دا لە خۆیم بیستووە ونووسیومەتەوە لە دەستنووسێکی مامۆستا نەجمەدین مەلا دا هەیە کە ساڵی ١٩٥١ نووسیویتی یەوە...

❂

---

سەرنج:

---

سەرجەم ئەو دەستنووسانەی لەم باسەدا ناویان هاتووە لە کتێبخانە تایبەتی یەکەی خاوەنی ئەم باسەدا پارێزراون لە پاڵ کۆمەڵێ دەستنووسی تردا.

ڕەخنەو لێکۆڵینەوە:

# پێـداچوونـەوەی سێ سەرنجی شانۆیی

- ڕێبوار سیوەیلی -

---

شانۆیی «کوێر ئۆغلی» لە ١٣ ـ ١٩٨٤/١٢/٣٠ لەسەر شانۆی چالاکی قوتابخانەکان بەهاوکاری کـۆمەڵێـک لاو پێشکەش کـرا. ئەم شـانۆنـامەیـە لە «ئەفسانەی کوێر ئۆغلی»ی یەشار کەمـال و چیرۆکێکی کـەلەپووری سـەمەدی بیهرەنگی یەوە بەناوی «کوێرئـۆغلی و هـەمزەکـەچەڵ» لە لایـەن کاك شـەفیق محەمەدەوە ئامادە کراوەو هەرخۆشی هەستا بەدەرهێنانی.

کاك دلاوەر قەرەداخی لە ژمارە (١) نووسەری کورد ـ خـولی سێیەم ـ ووتارێکی ڕەخنەیی بەناوی «شانۆنامەی کوێرئۆغلی لەبەر تیشکی سێ سەرنجدا» نووسیوە.. دیارە خاوەن ووتار لەچەند خاڵێکی گرنگی شانۆیی یەکە دواوە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو شانۆیی یە لەدوو سەرچاوەی جیاوازەوە ئامادەکراوە و کـاك دلاوەریش لێکی جودا نەکردونەتەوە، بۆیە لەگەڵێك جێدا تێبینی یەکانی مەبەست ناپێکن.. هەروەکو خۆشی دەڵێت جارێك شانۆنامەکەی بینیووە.. لەبەر ئەوە ڕێی تێدەچێت لاوازی تێبینی یەکانی لەئەنجامی ئەو یـەکجار بینینـەوەبن ! تەنیـا جارێك بینینی شانۆنامەیەکی وا، نابێتە ڕێگر بۆ لەسەر نووسینی، بەڵام دەبێت ڕەخنەگر بزانێت لەسەر کام لایەنی بنووسێت، لایەنی هونەری یان مەبەست و بیری بابەتەکە ؟. بەهەرحاڵ، من لێرەدا بەپێی توانا وەڵامێکی چەند لایەنەی بۆچوونەکانی کاك دلاوەر دەدەمەوە. هیوا خوازیشم جێگەی خۆیان بگرن:-

ڕەگەزی فیکر لە شانۆنامەکەدا، یان ڕاستر بڵێین تەوەرەی ڕووداوەکان لەسەر دوو فیکر دەخولێنەوە... کە هەرکامێکیان خاوەن سیماو تایبەتی یەکی خۆیەتی و یەکەمیان دەبێتە تەواوکەری دووەمیان و دووەمیش هۆی مانەوەی یەکەمە.. دەتوانین دەست نیشانی هەردوو فیکرەکە بەم شێوەیە بکەین:

یەکەم: فیکرەی سەرەکی شانۆکە (الفكرة الرئيسية).

دووەم: فیکرە جوڵاندنەوەی شانۆیی یەکە (الفكرة المتحركة).

فیکرەی سەرەکی شانۆنامەکە لەوەدا خۆی دەبینێ کە کوێرئۆغڵی و هاوڕێکانی لەسەر بنەمایەکی مەوزوعی داوایانەتە چیاو دەیانەوێت تۆڵە لەبەگی بوڵوو پاشای عوسمانی بکەنەوە. ئەمەش لەئەنجامی «میل» هێنان بەچاوەکانی پیریوسفی مەیتەری بەگی بوڵوودا. بەڵام ڕەوتی شانۆیی یەکە گۆڕانێکی دی تێدەکەوێت ئەویش بردنی دوو جوانووەکەیە لەلایەن ڕەوشەنەوە، ئیتر لێرەوە هاوکێشەکە دروست دەبێت و ئەم کردە نوێیە، واتە زیادکردنی (قیرات و دورات) بۆسەر ڕووداوەکە دەبێتە فیکرەی جوڵاوی شانۆیی یەکە. (الفكرة المتحركة). هەریەك لەم دوو فیکرەیە بینەر بەلای خۆیاندا ڕادەکێشن و ئەو هەڵوێستە عەقڵی یەی کە دەرهێنەر دەیەوێت دروست دەبێت. بەڵام دەوری دەرهێنەر وەکو شیکەرەوەی کێشەو مل ملانێکە لەدەرخستن و ئیبراز کردنی هەریەك لەو دوو فیکرەیەدا خۆی دەنوێنێت، بەپشتیوانی ئەو هۆکارانەی بەکاریان دێنێت لە شیکردنەوەی ڕووداوەکاندا.. ئەم مەسەلەیە لەشانۆیی (هاملێت) یشدا بەڕوونی دەبینرێتەوە. تەماشادەکەین بابەتەکە لە هاملێتدا کوشتنە، فیکرەی سەرەکی دەبێتە تۆڵەسەندنەوەو گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، تارمایی باوکی هاملێتیش دەبێتە فیکرەی جوڵاو.

هەر لەبەر بوونی ئەو دوو ڕەگەزە فیکری یەشە ناتوانین سیمای پاڵەوان (بەمانا فراوا نەکەی) ببەخشینە هاملێت و کوێر ئۆغڵیش ! چونکە مەودای کارتێکردنی هەریەك لە (تارمایی باوکی هاملێت و قیرات و دوراتیش) کەمتر نی یە لەسەر ڕووداوەکان لە مەودای کارتێکردنی هەریەك لە کەسێتی هاملێت و کوێر ئۆغڵی...

- ئەمە بێ گوێدانە ئەو قۆناغە مێژوویی یەی هەریەك لەم دوو شانۆیی یەی تێدا نووسراوە.

بۆیە هەندێجار دەرهێنەر بەپێی ئەو هەڵوێستەی لای خۆی دروست بووە پەنادەباتە بەر ئیبرازکردنی لایە نێکیان. هەروەکو کاك شەفیق کەسێتی کوێرئۆغڵی لە سەرەتاوە بارزکرد، بەڵام نەی توانی قەناعەت بە بینەر بکات کە کەسێتی کوێرئۆغڵی پاڵەوانەو هەڵگری فیکرەی گشتی شانۆنامەکەیە، گەرچی

خۆشی وای نەویستایە... کەواتە کوێرئۆغلی‌و هاوەڵەکانیشی مادام نەبونەتە هەڵگری سیمای چینایەتی خۆیان، ناشتوانن تەحدیدی هەریەك لە جەمسەرە سلبی‌و ئیجابی یەکە بکەن. کەواتە دەبێت دەرهێنەر بوعدی ڕۆمانسی‌و میسالی‌یان پێ ببەخشێت، بۆئەوەی بینەریش هەڵویستی خۆی بەرامبەر هەردوو بەرەکە دەست نیشان بکات.

هەرچی مۆسیقاشە، وەکو وەسیلەیەکی کاریگەر نەك بۆ (توندو تۆڵ کردنی ڕەگەزە فیکری‌یەکە)! بەڵکو وەك هۆکارێکی یارمەتی دەری دەرهێنەر لە شی‌کردنەوەی مل ملانێکەدا، دەوری خۆی دەبینێت‌و پاشان ئەم کاری گەری‌یە لای بینەر دەبێتە پەلەکردن لە هەڵوێست وەرگرتندا... کە دەرهێنەری زیرەك بڕێ‌جار لەبری ئەوەی بە دیالۆژ شتەکان شی‌بکاتەوە، دێنێ ئەو دەورە کارێگەرە دەداتە مۆسیقاو بەکاری دێنێت...

ئەگەرچی (دایکە ئازاکەی بەرتۆڵد برێشت) نامرێت ! بەلاّم ئێمە مەبەستی برێشت لە بەکارهێنانی ئەو مۆسیقایە لەکۆتایی ئەو شانۆیی‌یەدا ڕوون دەکەینەوە: لەپێشەکی چاپی شانۆنامەی «هەڵچوون‌و داچوونی شاری ماهاگۆنی» دا برێشت نووسیویەتی:

(دەبێت مۆسیقا هۆیەك‌بێت بۆ شیکردنەوەی کێشە سەرەکی‌یەکە، نەك توندو تۆڵ‌کردنی. هەر وەها دەبێت هەڵوێستی بینەر لەبەر دەم کێشە سەرەکی‌یە کەدا بەرێتە پێشێ‌و ڕەنگ‌و ڕوویەکی دی پێ ببەخشێ).

لەبەرئەوە ئەم کردەیە پێش‌ئەوەی دەورەکەی وابگێرێت کە جەماوەر دوورخاتەوە لە (خرۆشاندنە هەستی‌یەکەی) هەستا بە ڕوونکردنەوەی لایەنەکانی ئەو کێشەیەو بەمەش کاتی وەرگرتنی هەڵوێستی فیکری بینەری نزیك خستەوە. بەپێچەوانەی مۆسیقا لەدرامای ئەرستۆیدا، کە هۆیەکی هاندەرە بۆ بینەر خستنە گێژاوی ڕووداوەکەوە.

ئەمە جگەلەوەی دەرهێنەر پشتی بە شانۆی مەلحەمی نەبەستبوو بۆ دەرهێنانی شانۆیی‌کە، بەڵکو تەنیا سوود لێ وەرگرتن بوو !!. هەرچی بەکارهێنانی فلیمی سینە مایی‌و سلایدیشە، دیسانەوە هۆیەکی دین بۆ نزیك خستنەوەی بینەر لە واقیعەوەو دنەدانی بینەر لە بەرامبەر هەڵوێست وەرگرتندا.

□

◀

# کوێرئۆغلی لەنێوان ئەفسانەو واقیعدا

گەرچی ئامادەکەری شانۆیی‌یەکە، سوودی لە هەردوو بابەتە کەی یەشار کەمال‌و سەمەدی بیهرەنگی وەرگتبو، بەلام وەکو دەردەکەوت زیاتر سیمای بابەتەکەی بیهرەنگی پێوە دیار بوو. بۆیە تێبینی‌یەکەی ئێمەش لەو دەلاقەیەوەیە... یەکێك لەو ڕەنگو ڕووە تایبەتی‌یانەی ئوسلوبی سەمەدی پێ جیا دەکرێتەوە لە ئوسلوبی کەسانی دی ئەوەیە سەمەد دەیەوێت هاوکێشەیەك لەنێوان ئەفسانەو واقیعدا دروست بکات. هەر بۆیەشە ناتوانین بەو بەرهەمەی کاك شەفیق پشتی پێ بەستبوو بڵێین «ئەفسانە». چونکە سەمەد کاتێك ئەو بابەتەی نوسیوەتەوە ویستویەتی ئەو سیمایەی پێ ببەخشێ‌و ئەو ڕەنگو ڕووە واقیعیانەیەی تێدا بەرجەستە بکات... ئەم پرۆسیسەش (العملية) لای سەمەد تێهەلکێش کردنی دوێنێ‌یە بە ئەمڕۆوەو هەنگاو نانە بۆ دواڕۆژ.

دیسان یەکێك لە سیماکانی تری چیرۆکەکانی بیهرەنگی بوونی پاڵەوانی شاراوە (المختفي) کە ئەم پاڵەوانانە دەورێکی زۆر کاریگەر دەبینن لە فیکرەی بابەتەکانیدا بەگشتی بێ‌ئەوەی ببینرێن.! هەردوو لەم سیمایانە بە هەوڵەکەی کاك شەفیقەوە دیاربوون، کە یەکەمیان شی‌کردنەوەی ڕەمزە ئەفسانا‌وی‌یەکە بوو (قیرات و دورات) وەکو فیکرەیەك، پاشان ئاگادار کردنەوەی بینەر لەوەی کە «نیگار» منداڵی دەبێت. ئەم منداڵە جگە لەوەی دەبێتە پاڵەوانە سەرەکی‌یەکە، ڕێك‌و ڕاست دەشبێتە کاکڵەی فەلسەفەی بیهرەنگی‌و دوامین ڕووداوی «ئێستا»ی ناو بابەتەکەیەتی‌و یەکەم دیاردەی «داهاتوو»ی مەسەلەیەکی گەورە ترە.

لەبەرئەوە سەمەد هەروەکو چۆن ویستویەتی بابەتە کەلەپووری‌یەکە لە چوارچێوەیەکی واقیعیانە ترو نوێ تردا بنووسێتەوە، ئاواش ئاگاداری ئەوەی کردووە کە «حد»ێك دروست بکات لەنێوان کەسێتی نێو بابەتە کەلەپووری‌یەکە

داو کەسێتی پاڵەوانەکانی زادەی بیری خۆی... ئەوەش لەڕوانگەی لێکدانەوەی ئەو قۆناغە مێژوویی یەی کە هەرکامێك لەو دوو جۆرە کەسێتی یەی تێدا خوڵقاون..

نموونەی ئەم جۆرە پاڵەوانانە لای بیھرەنگی زۆرن. بۆ نمونە چیرۆکی «ئولدوزو قەلە ڕەشەکان». ئەگەرچی ئولدوز تەوەرەی گشت ڕووداوەکانە، بەلام نابێتە پاڵەوانی بابەتەکە بەڵکو دەوری ڕوونکردنەوەو ناسینی کەسێتی پاڵەوانی ناو چیرۆکەکە دەبینێت کە خوشکە کەی یەشاری هاوڕێی ئولدوزە... واتە پاڵەوانە حەشاردراوە «مختفي» یەکە. یان لە «ئەفسانەی خۆشەویستی»دا قوچ عەلی هەمان دەوری ئولدوزی هەیە، لەبەر ئەوە ئەمیش نابێتە پاڵەوان، تەنیا ڕێ خۆشکەرێکە بۆ دەست نیشانکردنی پاڵەوانی حەقیقی ناو ئەفسانەکە کە «هەلاڵە»یە.. ئەمە بێ گوێدانە زۆری و کەمی ناساندنی ئەو جۆرە کەسایەتی یانە لە چیرۆکەکاندا.

هەرکامێکیش لەم کەسایەتی یانە، چ خوشکی یەشارو چ هەلاڵەش، پاڵەوانی ئێستا ـ «حاضر» نین ! بەڵکو نووسەر دەیەوێت لەئەنجامی زیندوو کردنەوەی پاڵەوانەکانی دوێنێ وەو نیشاندانی واقیعی ئەمڕۆوە پاڵەوانی بەرجەستەی خاوەن هەڵوێست بخوڵقێنێ، کە ئەوەش بەڕوونی لەچیرۆکی «ماسی یە ڕەشە بچکۆلەکە» دا، دیارە...

لەبەر ڕۆشنایی ئەو حەقیقەتانەی سەرەوەو پشت بەستنی ئامادەکەر بە بابەتەکەی بیھرەنگی دەتوانین دەست نیشانی ئەو هەڵە زەقە بکەین کە کاك دلاوەر لەئەنجامی ئاگانەبوونی لەڕەنگو ڕوو ئەبعادی کەسێتی پاڵەوانە کانی بیھرەنگی تێی کەوتووە. ئەویش تەماشا کردنی کەسێتی کوێرئۆغلی یە وەکو پاڵەوانی فیکری شانۆنامەکەو تاوانبار کردنێتی بە دروست کردنی (ڕقوکینە لە ناخی خۆیدا بەرامبەر بەگی بۆلوو ! لە ئەنجامی ئەوەی «میل» بەچاوی باوکیدا هاتووەو پاشانیش کە نیگاری ناسی و بۆی دەرکەوت باوکی ئەویش لەدیوەخانی بەگدا قوڵی بردراوە، ئەم ڕقە دەبێتە تۆڵە سەندنەوە !!).

باوەڕ پێ بوونی کوێر ئۆغلی بە تۆڵە سەندنەوە، بنەمایەکی میسالی هەیەو هەر ئەوەشە بزوتنەوەکەی کوێرئۆغلی وەکو بزوتنەوەیەکی عەشایەری لێکردووە.
یان هەروەکو کاك دلاوەر دەڵێت: (دوای نیشتەجێ بوونیشیان لە «چاملی بێل»دا، سیفەتێکی خۆ بەدەستەوە دەرانە بەخۆیەوە دەگرێ و پیلانەکەشی تەنها لە چوارچێوەی چاملی بیلدا سەقامگیر دەبێت)...

ئەم ڕەفتارەی کوێر ئۆغلی وەکو کەسێتی یەکی سلبی لە شانۆنامەکەدا، دیسانەوە هۆیەکی هاندەرە بۆ خۆ دۆزینەوەی بینەر لە واقیعداو پێزانینی ئەرکی

سەرشانی. جگە لەوەی بەئاواتی بوونی مندالّەکەوە یان هاتنەوەو نەهاتنەوەی «قیـرات و دورات»ەوە هـولّەکـە جیّ دەهیلّیّت و لە ئـەنجـامی لیّکـدانـەوەی ڕووداوەکانیش هەلّویّستە عەقلّی یەکەی دروست دەبیّت. لیّرەوە دەتوانین بلّیّین، بینەر پاش ئەوەی هەردوو بەرەکەی جیا کردەوەو کەوتە بیرکردنەوە، ڕووداوی یەکەم کۆتایی دیّت و بیرکردنەوەی ئەویش لە «قیـرات و دورات و مندالّەکـەش» دەبیّتە بەردی بناغەی ڕووداوی پاش ئەم ڕووداوە کە خۆی دەوری تیّدا دەبینیّت بە هەولّدانی بۆگەیشتن بەهەردوو ئـەسپەکـە، وەکو ڕەمـزی فیکرەیـەك ئنجا مندالّەکەش کە دەبیّتە هەلّگری ئەو فیکرەیەو جاریّکی دی کویّرئۆغلّی یەکی کامل دەبیّتەوە سیقە لای چاملّ بیّلّی یەکان... گۆرانە کەش لەمخالّەوە دروست دەبیّت واتە دراماکە کۆتایی پیّنایەت...

هەلّبەت ئەم تیّبینی یەی ئیّمـە لە ڕوئیای بیهـرەنگی یەوە بـۆمەسـەلەکە سەری هەلّداوە. هەرچۆنیّکیش تەماشای بکەین ئامادەکەر نەیتـوانیوە خـۆی لیّڕزگار بکات و هەولّیّکی سەرکەوتوانەشی داوە...

لەکۆتاییدا دەلّیّم، گەرچی من سەر باسەکانی ووتارە کەی کاك دلاوەرم نەگرتوون، بەلاّم بەگشتی تیّبینی یە کانم ووتارەکەی دەگرنـەوەو هیواداریشم جیّی خۆیان بگرن.

---

**کۆتایی**

---

خوشك‌و برایانی بەڕێز

ئامادە بووانی یادی تازەکردنەوەی ٢٠٠ ساڵەی شاری سلێمانی خۆشەویست..

● کە بوترێ سلێمانی، وێنەی رەسەنایەتی‌و کوردایەتی‌و بێگەردی لە سەر ئاسۆی شانۆی روانینمدا ئەدرەوشێتەوە.. شیعرە بەتام‌و لەززەتەکانی باباتاهیرو خانی‌و نالی‌و شێخ‌نوری‌و بێکەس‌و گۆران ئەبن بە پەپولەی رەنگاو رەنگ‌و هەموویان پێکەوە ڕوو ئەکەنە گوڵ‌و گوڵزارەکەی سەیوان‌و پاش چەند دەقەیەك ئەوەن لە شەقەی باڵ بەرەو بەردە قارەمان ئەفڕن، بۆ ئەوەی بەڵێن‌و پەیمانی خۆشەیستی‌و خۆ سووتانیان لە پێناوی مانەوەی ووشەی رەسەن‌و بەرەو پێشەوە چوون‌و کۆڵنەدان تازە بکەنەوە..

● کە ناوی سلێمانی ئەبیستم، هەرچی شتی نەمرو بەهێز هەیە لەم کوردستانە خۆشەویستەدا سەر دائەنوێنێ‌و بەدەم ئاهەنگ‌و رەشبەڵەك‌و زەماوەندەوە سروودی ئەی رەقیب‌و نەورۆز دووبارەو سەدبارە ئەکاتەوە.

● زۆر ئاسایی‌یە کە روبارەکان شانازی بە هاژەی شەپۆلەکانیان بکەن، کێوەکان بە لووتکە بەرزەکانیان، کانیاوەکان لە ئاوە ساف‌و بێگەردەکانیان دەریاکان بەقوڵایی دەروونیان، باڵندەکان بەوەی کە پێان ئەکرێ جەرگی ئاسمان بدڕن‌و بگەنە ئەو پەڕی بەرزایی‌یە وە..

واتە کوردیش بەگشتی‌و ڕۆڵەکانی شاری سلێمانی خۆشەویستیش بەگشتی بۆیان هەیە شانازی بە سلێمانی بکەن، چونکە ئەم شارە قارەمانە بە درێژایی تەمەنی‌دا نە مەحکوومی عەجەم بووەو نە سوفرەکێشی ئالی عوسمان..

بەڵێ کورد بۆی هەیە شانازی بەم شارە بکات چونکە شاری هەڵمەت و قوربانی‌یە، شاری ئازایەتی و دلێری‌یە، شاری شەشی ئەیلول و بەردەرکی سەراو حوزەیرانە، شاری ئەدەب و هونەر و شیعرە.. شارە خۆشەویستەکەی شێخ مەحموودی نەمرە..

● ئەم هەنگاوەش کە یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لقی سلێمانی ناویەتی بۆ تازەکردنەوەی یادی دووسەد ساڵەی دامەزرانەی ئەم شارە، باشترین نموونەیە بۆ وەفاداری و دڵسۆزی نووسەرەکان بەرامبەر شارە خۆشەویستەکەیان.

● منیش بەناوی گۆڤاری نووسەری کوردەوە کە دەنگێکی راستەقینەی نووسەرانی کوردە بە گشتی بە ئەدیبانی سلێمانی، یاخود بە دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کوردی لقی سلێمانی ئەڵێم، پیرۆزبێت کردەوەکەتان، پیرۆزبێت ئەم هەنگاوە بەنرخەتان و بڕوام وایە کە شارە قارەمانەکەتان هەر وەك خۆی ئەمێنێ و بە هەمیشەیی سەر قافڵەی کاروانی پێشکەوتنی کورد ئەبێ..

محمد بەدری

سەرنووسەری گۆڤاری
نووسەری کورد
١٩٨٥/٩/١٥

# هەگبەی هەولێر

**بەتەلەفۆن: سیفەر**

ساڵی ئەم ساڵەی شارە دێرینەی هەولێر لێواو لێو بوو لە کۆڕو دیدارو زنجیرە لێکۆڵینەوەی هەمە چەشنەی ئەدەبی و فیکری و هونەری و ڕۆشنبیریی بە جۆرێ کە هەم دڵخۆش و هەم مایەی تێرامان و باری سەرنجێکی وردەو پێویستی بە هەڵوەستەیەکی قووڵ و لەبارو لێتۆژینەوە هەیە، دەکرێ ئەم ساڵ - هەر وایشە - بە ساڵە زێڕینەی کۆڕ بەستن بدرێتە قەڵەم و سوپاسێکی گەرم و پیرۆزباییێکی گەرم تریش لەو دام و دەزگا ڕۆشنبیریی و ئەدەب و میللیەیانە بکرێت کە بەو پەڕی لەخۆبوردنەوە هاتنە کۆڕی کۆڕ بەستن و دڵ و چێژ دەروون و بیری دانشتووانی ئەم شارەو نەخوازەڵلا کۆڕی ئەدیب و ڕۆشنبیرانیان زاخ داو بوونە مایەی ئەو هەموو دەست پێشکەری و شانازییە، هیوا دارین لە وەرزە جیا جیاکانی ڕۆشنبیری و لەمەو لای خۆیان داو لەبەر پلانێکی وردو بزێودا لەم لێپرسینەوە یەدا بەردەوام بن و ویژدانی مێژوویی و ڕۆشنبیری خۆیان بەسێننەوەو دریغیش لە بەستنی هیچ جۆرە کۆڕێکی بە جۆش و خۆش نەکەن و دووریش بن لە وەیشوومەی ڕۆژگارو لە هاش و هووشی «**مزایدات**» و لە مەچەك بادان و لە ڕق و کینەو بەگیانێکی برایانەو بە بیرێکی دیموکراتیانە سەربەستانە بکەونە فریای (**ڕاستی**) **و** فریای وشەی پیرۆزی کوردی، گومانیش نییە هیچ شتێك لە ڕاستی گەورەتر نیەو ئەبێ هەموو لایەك لەبەردەم (ڕاستی)دا دەست لەسنگ بن مەبەستیش هەر تەنیا خزمەتی ئەو وشەیەیەکە هەموومان هەڵوەداو شەیدای ئەوین.

## ● یەکێتی نووسەرانی کورد ●

١ - بەبۆنەی ئاهەنگەکانی ئازارو نەورۆزەوە یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد - سەرکردایەتی لقی کوردستان و هەر سێ لقەکەی لە هەولێرو دهۆك و سلێمانیدا میهرەجانێکی خنجیلانەی شیعربان ڕێك خست و شاعیرانەی تێدا بەشدار بوون: (ساجد ئاوارە - پیربال محمود - عەدنان ئەترووشی - سامیە محەمەد - عبدالخالق سەرسام - ڕەمەزان عیسی - صلاح محمد - عبدالرحمن

مزوری ـ محمد ئەمین پێنجوینی ـ عوسمان شەیدا ـ خالد حسین ـ دلشاد مەریوانی ـ شەهاب عوسمان).
٢ ـ زانکۆی (صلاح الدین)یش بە هاریکاری لەگەڵ. دەستەی رەخنەگرانی ئەدەب شان بە شانی یەکێتی نووسەرانی کورد لە ناوەڕاستی نیسانی ئەم ساڵەدا زنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی فراوانی بۆ ئەدەبی بەراوردکاری سازکردو گەلێ لێکۆڵینەوەی بە پێزو شایان و بەنرخی تێدا رەپێش کراو چەندەها موناقەشەی بۆ سازدرا ئەوەی شایانی باسیش بێت و مەبەستی ئێمە بێت ئەو نووسەرە کوردانە بوو کە لەگەڵ برا عەرەبەکانیان دا بەشداری ئەو زنجیرە بایەخدارەیان کرد (د. کامل بصیر ـ کریم شارەزا ـ رەئوف عوسمان ـ ئەحمەد سالار ـ حەمە فەریف حەسەن ـ عبدالله عەباس ـ محەمەد ئەمین هەورەمانی) هەر وەها لە رۆژی سێیەمی زنجیرەش دا هەمدیس کۆڕێکی شیرینی شیعر خوێندنەوە بۆ شاعیرانی کوردو عەرەب هاتەکایەوە ئەو شاعیرە کوردانەی کە بەشداریان تێدا کرد ئەمانە بوون (محەمەد ـ بەدری ـ خورشیدە بابان ـ محەمەد ئەمین پێنجوێنی ـ ئەحمەد تاقانە ـ صلاح شوان).

## • دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی •

١ ـ بۆ یەکەم جارو ئەم ساڵەو لەرۆژی رۆشنبیریی کوردیدا ئەم دەزگایە میهرەجانێکی فراوانی بۆ شیعرو ئەدەب سازداو بۆ ماوەی سێ رۆژ خەڵکی شاری خستە خرۆشان لە رۆژی یەکەما ئەم شاعیرانەو هەریەکە لە روانگەی چێژی خۆیەوە چەند شیعرێکی پێشکەشی دانشتوان کرد (پیربال مەحموود. مەغدید ـ سۆران ـ عبدالله عەباس ـ جەلال ساکار ـ عبدالخالق سەرسام ـ جەلال خۆشناو ـ نازم دڵبەند ـ ئیسماعیل) لەرۆژی دووەمیشدا پیشانگایەکی فراوانی (کتێبی کوردی) لە هۆڵی کتێبخانەی گشتی هەولێر بە ئەنجام گەیاند لە دوا رۆژیشدا دەستەیەکی هەڵبژاردە لە سترانێژانی کورد (حسین عەلی ـ گوڵبەهار ـ عیسا بەرواری ـ خەلیل وەندی ـ فؤاد ئەحمەد) کۆتاییان بەو رۆژە پیرۆزە هێنا.
٢ ـ کۆڕێك بۆ کاك شێرزاد عبدالرحمن بە ناوی (رۆژنامەگەری و داهێنان).
٣ ـ کۆڕێك بۆ کاك مەحموود زامدار بە ناوی (پیشکەوتی ئەدەب و زمان لە کوردستانی بەدرخانەوە تاکۆتایی گۆڤاری گەلاوێژ).
٤ ـ کۆڕێ بۆ کاك مەحمەد خدر بە ناوی (چەن هەڵوەستەیەك لە بەردەم خڕبارانی ئەنوەر مەسیفی).

٥ ـ بەبۆنەی لەدایك بوونی سەرۆكی بەڕێز صدام حسین هەمدیس لەلایەن ئەو دەسگایەوە كۆڕێكی گەورە بۆ مامۆستا جەلال خۆشناو سازێنرا.
٦ ـ لە وەرزی دووەمی رۆشنبیری ئەو دەزگایەش داو بە بۆنەی جەژنەكانی تەمووزەوە كۆڕێكی فراوان بۆ مامۆستا مەولوود سوورچیو بە ناوی (چەن لایەنێكی مێژوویی ئێران عیراق) سازدا.
٧ ـ هەر بۆ هەمان بۆنە كۆڕێكی خنجیلانەی شیعری بۆ ئەم شاعیرانە ساز اد (عبدالله ئەقدسی ـ مەحمەد سالح ـ جەلال خۆشناو ـ مەغدید سۆران ـ سەفەر شەعبان ـ وەصفی ردێنی ـ صلاح سەیدۆك.. تاد).
٨ ـ كۆڕێك بۆ كاك سەروەر ئەحمەد بە ناوی (دیستۆفیسكیو ژوورەكەی راسكۆلینكۆف).
٩ ـ كۆڕێ بۆ كاك موحسن ئەحمەد بە ناوی (مەرگو خۆشەویستیو سێكس) لە دیوانی هاشم سەراجدا.
١٠ ـ كۆڕێكی فۆلكلۆری بۆكاك عومەر عەزیز بە ناوی (دابو نەریتی كوردەواری لە دەشتی هەولێردا).
١١ ـ كۆڕێكی رەخنەیی بۆكاك خالد جوتیار بە ناوی (ئەفسانەی كوردیو دێوی گردی رەش).
١٢ ـ كۆڕێ بۆ چلەی شاعیری دەشتی هەولێر (مەلا خەلیلی موخلیس) لە لایەن كاك جەلال سنجاوییەوە.
١٣ ـ كۆڕێكی شیعر خوێندنەوە بۆ ئەم شاعیرە لاوانە (فریدون بەرزەنجی ـ ئیسماعیل بەرزەنجی ـ صباح رەنجدەر ـ مەحمەد حوسێن هەڵەبجەیی ـ قوباد جەلی زادە ـ.. تاد).
١٤ ـ كۆڕێ بۆ كاك (فەیسەل دێهاتی) بە ناوی (گەرم بوونەوە یا گەرم نەبوونەوە لەلای جەلال بەرزەنجیدا).
١٥ ـ كۆڕێ بۆ مامۆستا جەلال خۆشناو بە ناوی (دەروازەیەك بۆ كاوێس ئاغای نەمر).
١٦ ـ كۆڕێكی زانستی بەڤیدیوو فانووسی سیحری بۆ دوكتۆری قوتابی جەلال صدیق بە ناوی (مایەسیری لە ژێر نەشتەری بزیشكیدا).
١٧ ـ كۆڕێ بۆكاك حەیدەر عبدالرحمن بە ناوی (چەند سەرنجێكی رەخنەگرانە لە شانۆگەری خەوسیامەند).
١٨ ـ بۆ یەكەم جار لە مێژووی شانۆی كوردیدا هەر لە لایەن ئەم دەزگایەو لە كۆتایی ئەم مانگەداو بۆ ماوەی سێ رۆژ زنجیرە لێكۆڵینەوەیەكی فراوانی (شانۆو ئەدەبی شانۆیی) ساز ئەدرێو گەلێ شانۆ نووسو هونەرمەندی تێدا بەشدار دەبێت.

## • ئەمینداریێتی گشتی رۆشنبیری و لاوان •

لەلایەن ئەم ئـەمینداریێتییـەو بە هـۆی بەڕێـوەبەرایـەتی رۆشنبیری جەماوەر ئەم کۆڕە رۆشنبیریانەش ساز دراون:ـ

١ ـ کۆڕێ بۆ مامۆستا مەلا عەزیزی ڕەش بە ناوی (رەشایەتی و سپییـاتی لە دەشتی هەولێردا).

٢ ـ کۆڕێ بۆ کاك روستەم بـاجەلان بـە ناوی (کـارتێکردنی مـەتەڵ بـەسەر بەرهەمی ئەدەبی کوردی).

٣ ـ کۆڕێ بۆ کاك بەیاد عبدالقادر بە ناوی (دەنگ سازی لە زمانی کوردیدا).

٤ ـ کۆڕێکی فۆلکلۆری بۆ مامۆستا مەلا داود .

٥ ـ کۆڕێکی رەخنەگرانە بۆ مامۆستا حسێن رواندزی.

ئەوەی شایانی باسیش بێت و جێگەی سەرنج و تێڕامانێکی تیژ بێت ئەوەیە کە هەر لەم ساڵەدا گەلێ شانۆگەری گەلێ پیشانگای هەمە جـۆری پلاستیکی و فۆتۆغرافی لە سەرانەری ئەم شارەدا سازدراوەو موژدەیکی مەزنی پێیـەو نیاز خوازیشین هەموو لایەك لە ئەرکی پیرۆزیان دا سەرکەوتوو بن.